# پێشکەش

ئەمە نوسخەی تۆیە لەکتێبەکەم، بەڵکو لەدڵم((وأخيراً أكتشفت السعادة - سەرەنجام بەختەوەریم دۆزییەوە)).. پوختەی ئەزموونی خۆم لەگەڕان بەدوای بەختەوەریی و زەردەخەنەو جوانیدا، تێکردوە، وەك دیاریی وەربگرە؛ چونکە تۆ یەکێکی لەهۆیەکانی بەختەوەریی بۆ خەڵکی دەوروبەرت .

**کەسێك کە خۆشیدەوێی: عائیز قەرەنی**

## پێشەکیی وەرگێڕ

## بە ناوی خواوەندی میری مەزن

مرۆڤ لەوەتی هەیە بە دوای بەختیاریدا دەگەڕێت و، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە ژیانی پڕ بێت لە ئارامیی و ئاسوودەیی و، تەم و مژی خەم و حەسرەت و ناخۆشیی، ئاسۆی دڵ و دەروونی لێڵ نەکات و، دنیای فرەوانی لێ وەتەنگ نەهێنێ و ژیانی لەبەرچاوان نەبێزێنێ ... هەمووو جموجۆڵێکی مرۆڤ بەڵگەی ئەو ڕاستییە یە . بۆیە دەبینین لەجەنگەی ماندووبوون و کەنەفت و شەکەتیدا بە ئیش و کار، بەچەند وشەیەکی دڵنەواز و گیانپەروەر، جا شیعر بێت یان هەر شتێکی دیکە، گیانی ئاوپڕژێن دەکات و، سەرەنجام ئۆخژن بە دەروونیدا دێت و دەحەسێتەوە . ئەوە هەوڵێکی سادە و زگماکی سۆراغکردنی بەختەوەرییە و دەریدەخات کە مرۆڤ تێکەڵاوێکی لەش و گیانە و، دەبێ ئەو دووانە هاوسەنگ بن ، بۆ ئەوەی هەست و ژیانی لا سەنگ نەبن و پارسەنگی نێوانیان ڕاگرێت ... دەبێ بۆخۆی لەسەر زەویی و گیانی لە ئاسمان بێت و، لەو بارەوە سەرکێڵ نەڕوات و بەهەڵە نەچێت ... هەڵبەت بەختەوەریی لە نێو دڵ و دەروونی مرۆڤدایە و، دەبێ لەوێ سۆراغی بکات؛ دەنا لە هیچ شوێنێك نایدۆزێتەوە ... جا ئەگەر ئەم بابەتە لە هەمووو سەردەمێکدا وا بێت، ئەوە لە سەردەمی ئێستادا، کە دنیا لە ڕووی پێشکەوتنی ماددیی و تەکنۆلۆجیاوە گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز و، ئەم پێشکەوتنە مرۆڤی بە بەختەوەریی شاد نەکردوە و، نە یحەساندۆتەوە، زۆر لەپێشترە ! ئاخر مرۆڤی ئەم سەردەمە لە قەیرانێکی ڕووحیی گەورەدایە و، زۆربەی پێشکەوتنە ماددییەکە لەسەر حیسابی لایەنی گیانیی وی وەدیهاتوە و، لاسەنگییەکەی بردۆتە ئاقارێکی زۆر ترسناك ... دیارە لێشاوی ئەنتەرنێت و هۆیەکانی ڕاگەیاندن و بچووکبوونەوەی جیهان ، دەردەکەیان بە کوردی ماڵوێرانیش گەیاندوە ... گەلی ئێمە جاران سەرباری ژێردەستەیی و خراپیی لایەنی ئابووریی و سیاسیی ، لەڕووی دەروون وگیانەوە زۆر ئاسوودە بوو و، دەردە دەروونییەکان لەنێویدا زۆر دەگمەن بوون ... ئەوەتا هێمنی موکریانیی لە نێوەڕاستی حەفتاکاندا ، لە کتێبی ((توحفەی موزەففەرییە))دا گلەیی لە (پیرەمێرد)ی شاعیر دەکات کە لە (مەم و زین)ەکەیدا(خاتو زین) خۆی دەکوژێت؛ هێمن دەڵێ: پیرەمێرد ئەو دیارییەی لە ڕۆژئاواوە بۆ مە هێناوە و نەدەبوو وایکردبا؛ چونکە لە کوردستان خۆکوشتن نییە ! واتا: ئەو کاتە لە کۆمەڵی کوردەواریدا خۆکوشتن نەبووە ! بەڵام ئێستا لەسۆنگەی گەندەڵیی بێڕەزا و قڕیی و پڕیی و بێ کاریی و کولەمەرگیی و بێدادیی و هەژارییەوە ، جۆرەها دەردی دەروونیی وەك مۆتەکە سواری سەری بوون و، بێزاریی و بەش مەینەتیی کارێکیان پێ کردوە ،(( سەرما بە هەتیو ، با بە دەواری شڕی ناکا !)) و، مەلی خۆشیی و ئاسوودەیی و ئومێدیان تۆراندوە و، پێویستی بە چارەسەری ڕیشەیی هەیە، بۆ ئەوەی تاك و کۆمەڵی کورد چیدی بەرەو وێرانیی و دارمان نەڕوات ... لەو سۆنگەیەوە ، وەك بەرپرسیارییەك بەرانبەر گەلە هەژارەکەم، ویستم لەو بوارەدا بەشدارییەکی بچووك بکەم و، دارێك لەسەر بەردێك دانێم ؛ بەڵکو ئەوە خوایە ، ئەو زنەی ئومێدەی ماوە ، ببێتە کانیی و، کانیی ببێتە جۆگە و جۆبار و سەرەنجام دەروونی تاك وکۆمەڵی کوردەواریی ببێتەوە گوڵستانی ئومێد و ئاسوودەیی .. جا ئەم کتێبەی

بەردەستت بەرهەمی ئەو تێڕوانین و بۆچوونەیە، کە پێم وایە لەو بارەوە کەلێنێکی چاك پڕ دەکاتەوە ، چونکە وێڕای ئەوەی لەشوێنی خۆی بەڕمێنترین کتێبە، هەموو بابەتەکانیشی هەڵێنجراوی واقیعی ژیانن و، دەکرێ چاویان لێ بکرێ وبکرێنە سەرمەشق، بۆ ئەوەی بە کورتترین ڕێدا دەستی خوێنەر بگرن و، قەدبڕ بیگەیەننە هەواری باسەفای ئاسوودەیی و بەختیاریی.. بەو ئومێدەی سوودێك بگەیەنێت وجێی خۆی بگرێت ...

**مستەفای سەید مینە**

**پشدەر – سەنگەسەر**

**٢٠٢٠/٧/٩**

## پێشەكیی

سوپاس بۆ خوا و، سەلات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەری خوا و، بنەماڵەو یارانی و، هەر كەسێك پشتگیریی كردوە.. ئەمە كتێبەكەمە :((وأخیراً أكتشفت السعادة – سەرەنجام بەختەوەریم دۆزییەوە))، كە پاش پەنجا ساڵ ئەزموون و خوێندنەوە و،گەڕان و دیداری زانایان و ئەدیبان و حەكیمان و شاعیران و ئەو كەسانەی جێی پرس و ڕاوێژن، نووسیومە و، بۆتە پوختەی ئەو شتەی دەگونجێ شارەزایەك لەم تەمەنەدا دەربارەی بەختەوەریی بیزانێت... ئەم كتێبەم بیست ساڵ دوای نووسینی كتێبی(( لا تحزن - خەمبار مەبە)) نووسیوە و،هیچی ئەوێم دووبارە نەكردۆتەوە؛بەڵكو ، لەچەند بابەت و بەسەرهاتێكدا كە بۆخۆم تێكەڵاویان بووم، یان گوێ بیستیان بووم و، وانەو دەرسم لێ هەڵێنجاون؛ ڕاستەوخۆ گەڕاومەتەوە ژیان و واقیع و مەیدان بۆ ئەوەی خوشك و برا خوێنەرە بەڕێزەكانم، بە ژیانی بەختەوەریی وئارامیی و ئاسوودەیی و ئاشتیی و قنیات و ڕەزامەندیی شاد كەم، بۆ ئەوەی ژیان بەسادەیی و هێمنیی و لێبوردەیی و تەبایی و دڵنیایی بەسەر بەرن، هەڵبەت ئەوانەش مەبەستەكانی ئایینی مەزنی ئیسلام و دواخوازیی ژیرو هۆشمەندانی جیهانن؛ چونكە هەموو كەس بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێت، لەبەر ئەوە بەسەرهاتگەلی خەڵكی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوام وەرگرتوە و، شتی زۆریشم نەهێناوە؛ چونكە نامەوێ لەم كتێبەمدا ئەو زانیاریی و بەسەرهاتانەی لە كتێبگەلی دیكەدا نووسراون، دووبارەكەمەوە. جا بەتەما بەرەكەتی خوا، داواكارم من و تۆش بەجۆرێك بەختەوەركات، قەت تووشی بەدبەختیی نەبینەوە و، لە من و تۆش بەجۆرێك ڕازیی بێت، دوای ئەو ڕازیبوونە قەت لێمان توورە نەبێت.

سڵاوانم قبووڵ كە .        كەسێكی كە خۆشیدەوێی: عائیز قەرەنی

# چاوان بنووقێنەو دنیا لەبیرکە

مامۆستا عەبدولعەزیز تویجەریی، کە لەپیاو ماقووڵانی قەسیمە، لەباغەکەی کە لەبەریدەیە، میوانی بووم.. ئەو ڕۆژە زۆر ماندوو بووم؛ چونکە هەر خەریکی موحازەرە و کۆڕو چاوپێکەوتنان بووم. کە عەسر نزیك بۆوە، دەستی گرتم و بردمیە ژوورێکی ماڵەکەی و، گوتی: دەمەوێ سێ دەقیقە بەشێوەیەکی سەیر، وەکو چارەسەری پزیشکی چینی، پشوو بدەی و ئاسوودە بی!

کاتیشم زۆر کەم بوو، لەچەند خولەکێك نەبێ، کاتی پشوودانم نەبوو، ئیدی لەسەر گازی پشتێ ڕاکشام و پێی گوتم:چاوان بنووقێنە و زارت داخە و، دنیا لەبیرکە!ئەمنیش لەگەڵ وی چاوم لەقووچ نان، مەعنای چاولەقووچ نانیش ئەوەیە کەئەو دیمەنە ورووژێنەرانە نابینی ژیان و کێشەو خەم وخەفەتانت وەبیر دێننەوە و، واتای زار داخستنیش ئەوەیە تۆ قسان ناکەی و، ئامادەی بچیە ئامێزی پشوودان وحەسانەوە و، مەبەست لە دنیا لەبیر کردنیش ئەوەیە هۆشت بە بیرکردنەوە لەژیانی دنیا خەریك نەکەی؛ چونکە خوا سەرپەرشتیی دەکات و هەڵیدەسووڕێنێ و مشووری دەخوات.

ئەوەتا ئێمە ئەو هەموو شەوە درێژانە دەخەوین و گەردوونیش هەر وەکو خۆیەتی ...

چونکە خوا دەیپارێزێ و، بوون و نەبوونی مە لەژیاندا وەکو یەکە و، ژیان و مردنیشمان هەر وا، ئێمە مرۆڤگەلێکین دەخۆین و دێین و دەچین و لەخەو هەڵدەستین و دەنووین .

گەردوون نە بەهاتنی ئێمە گۆڕانی بەسەردا هات، نە بە ڕۆیشتنیشمان دەگۆڕێ.

جا ئەمن لەو سێ خولەکانەدا هەموو شتم لەبیر خۆم بردەوە، بیرم لەهیچ نەکردەوە، پاشان هەستام دانیشتم. باوەڕم پێ بکەن هەستم بەحەسانەوەو ئاسوودەییەکی سەیرکرد! گوتی: ئەم مەشقەم لە چەند پزیشکێکی گەورە وەرگرتوە، هەر کاتێك ئیش و کارو زەحمەت و خەم و خەفەت تینیان بۆ هێنای، چاوان بنووقێنە و دنیا لەبیر کەو هەفت نەبێ ! چونکە بەو کارە ئاسوودە دەبی ودڵت ئارام دەگرێ و گیانت هێمن دەبێتەوە، ئەو کارانەش ویستگەی سەرەڕێن و هەر دەبێ بکرێن و، لە ئەزموونی سێ خولەکانەوە دەڵێم:خەمی دنیا لەخۆت بارمەکە، خۆ تۆ بەرپرس و مشوورخۆری ئەم گەردوونە نی و، تەنانەت قەزاوقەدەری خێزانەکەی خۆشت بەدەست نییە.

ئەگەر منداڵەکەت نەخۆش کەوت، ئەوە چارەسەری بەدەست خوایە، ئەگەر کچەکەت خەمێکی هەبوو، دەروولێکرانەوە لەخواوەیە،ئەگەر مۆتەکەی قەرز سواری شانانت بوو، لابردنی هەر لەخواوەیە، ئەگەر بەڵایەکیشت تووش بوو، لابردنی هەر بەدەست خوایە.

کەواتە کلیلی کاروبارەکان بدە دەستی خوا و، دنیا لەبیرکەو بزانە تۆ گەردیلەیەکی لەم گەردوونە و، مشوور و بەڕێوە چوونت بەدەست خوایە.تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە بەندایەتیی خوا بکەی؛ چونکە بەوە لێت ڕازی دەبێت و، بە چاکترین شێوە مشوورت دەخوات و، باشترین ڕێوشوێنت بۆ دادەنێ . ئێستا ژیانی ئێمە دەنگە دەنگ وچەرمە سەریی وکوێرەوەریی وماندوێتی دایگرتوە؛هەمووومان سەرقاڵی خۆمان وکێشەوخەمەکانی خۆمانین، سەرقاڵی خوێندنی منداڵەکانمان و پێداویستیی ماڵەکانمان و قایمە گەلی ئەو پارەیە دەبێ بیدەین و، ئەو ئیشانەی لەسەرمانە

بیانکەین و،ئەو برادەرانەی مافیان لەسەرمانە و، ئەو خاوەن قەرزانەی داوای قەرزەکانمان لێ دەکەنەوە و، تا کۆتایی لیستی دوورو درێژی پێداویستییەکانی ژیان.

کەواتە هەر دەبێ بەهێمنیی ژیان بەریە سەرو،جاروبارچاوان بنووقێنی و دنیا لەبیر خۆت بەریەوە تا کۆمەکت بگاتێ و، سەرەنجام کاروبارەکان بەو زاتە بسپێری کە ئاگاداری نهێنی نێودڵانە.

ئای لەو خولەکانەی ئاسوودەیی کە لەبەریدەی قەسیم بەسەرم بردن! قەت لەبیرم ناچن و، ناوە ناوە دووبارەیان دەکەمەوەوهێمن و ئاسوودە دەبم. ئای لەو سێ خولەکەی لەبرای مامۆستام : ((عەبدولعەزیز تویجەریی)) یەوە فێربووم و سوودم لێ وەرگرتن، کە ئەویش لەچەندان پزیشکی گەورەوە فێریان بووە و،لەنێو گێژاوی مەوعیدو ئیش وکاروسەرقاڵیدا،گیانێکی ئاسوودەیان بۆ گێڕامەوە! جاران کە سواری ترومبێل دەبووم، ماندوو و کەنەفت و کەلەلا بووم و گیانم هەتا بڵێی شەپرێو بوو، بەڵام ئەو سێ خوولەکە پشوو وحەسانەوە و، چاو نووقاندن و دنیا لەبیر کردنە، هاوسەنگیی و ئاسوودەیی و دڵنیایی خۆمی بۆ هێنامەوە!

کەواتە: لەسەر ڕێگای خۆت چەند وێستگەیەك دانێ بۆ پشوودان و حەسانەوەوئارامیی و، گەردوون بە وەدیهێنەرەکەی بسپێرە و، دروستکراوان بۆ دروستکەریان لێ گەڕێ و، کاروباری خۆت سپاردەی خواکە و، لەدوای هەر ویستگەیەك، گورج و چالاك وەڕێکەوە، هێمن وئارامیی وئاسوودەییت دەست دەکەوێت و، سەرەنجام چالاکیی و هێزو کۆمەکت وەگیر دەکەوێت.

## ئارام بگرە، چونکە هەموو شتێك سنوورێکی هەیە

لەگەڵ جەنابی شێخی زانا عەبدولعەزیز بن باز- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- لەمزگەوتی شا عەبدولعەزیز لە شاری ڕیاز- پایتەختی شانشینی سعوودیە – نوێژی هەینیم کرد، وتار بێژەکەی دکتۆرعەبدولوەهاب تەریریی بوو، وتارەکەی دەربارەی بیدعەوهاوبەشپەرستیی و پروپووچ وگۆڕستان لەجیهانی ئیسلامیدا بوو. شێخ سەعات یازدە، پێش نوێژی هەینی گەیشتە جێ و، نزیکەی دە ڕکات سوننەتی کرد، پاشان ڕووی کردە من ، کە لەپەنای دانیشتبووم و، سڵاوی لێ کردم و، ئەمنیش سڵاویم ستاندەوە. ئەمن ئەو کاتە لەتەنگانەدا بووم و،لەبەر چەند لەمپەرێك نەمدەتوانی نە وتار بدەم، نە موحازەرە پێشکەش بکەم ونە بانگەواز بکەم.

پێی گوتم : ((دەبێ ئارام بگری؛چونکە هەموو شتێك سنوورێکی هەیە))، بەو عیبارەتە. شێخ لە عیبارەتە کورتەکەی بۆوە، بەڵام لەناردنی پەیامگەلی هیواو گەشبینیی بۆ دڵ و سەراپای ئەندامەکانی لەشم نەبۆوە.کە لەمزگەوت چوومە دەرێ، دەتگوت بێجگە لە((دەبێ ئارام بگری؛چونکە هەمووشتێك سنوورێکی هەیە))، هەرچی گوتراوە لەبیرم چۆتەوە. هەر بیرم لەو قسەیە دەکردەوە و سەیرم دەکرد هەموو شتێك سنوورێکی هەیە؛قەیران، کێشە، برسیەتیی، نەخۆشیی، هەژاریی، قەرز، زیندان و هەرچی خەم وتەنگانەی ژیانە سنوورێکی هەیە. ئەو سنوورەش یەکسەر بۆ دژی خۆی لە دەرووڵێکرانەوە و خۆشیی و شادیی و ڕەحمەت دەگۆڕێت. براو خوشکان، ئەگەر تووشی کێشەو ناخۆشیی و کارەساتێك بوون، دەبێ ئارام بگرن؛ چونکە هەمووشتێك سنوورێکی هەیە. شەو هەرچەندە درێژ بێت، سنوورەکەی بەیانە و، سەرەنجام ڕۆژ دەبێتەوە و ڕوخسارە تازەکەی دنیا پەردەکات لە

مزگێنیی و هیواو خۆشیی و ڕووناکیی و دڵخۆشیی. گوریس هەرچەندە قایم و درێژ بێت، ڕۆژێك هەر دەبێت بپسێت. بێگومان کارەسات تەمەنێکی دیاری کراوی هەیە و، قەیران ماوەی خۆی هەیە و، تەنگانەش چەند ڕۆژێکە و تا سەر نییە،جا ئارام بگرن و چاوە ڕوان بن؛ چونکە ئارامگرتن و چاوەڕوانیی، دەروولێکرانەوە خوا پەرستییە و، هەموو شتێکیش سنووری هەیە. ((هەموو شتێك سنووری هەیە))، گومانی چاکت دەربارەی خوا دەداتێ و، وا دەکات بەرانبەر هەرچی لەلای خواوە بێت،گەشبین بی و، چاوەڕوانی ڕوحمی خوا و دەروولێکرانەوە بی، جا قەت لەبیرت نەچێت کە ((هەموو شتێك سنووری هەیە)). جا ئەگەر ئەم دەستوورەت لەزانایەکی پێشەوای شەریعەتزانی فەرموودەناسی بانگخوازی تەمەن نزیك لەنەوەت ساڵی زانی ، کە سێك ئەوەندە خاوەن ئەزموون بێ، دنیای دەقوونەکەو کردبێت و، وێڕای ئەوە سەر ڕاست و بەرچاو ڕوون و بلیمەت و لێهاتووش بێت، دڵنیا دەبی کە خێروچاکەت لەخوای باڵادەستەوە بۆ دێت.  جا سوپاس بۆ ئەو خوایەی ناخۆشیی وکارەساتی نەکردوونەتە هەمیشەیی و، خەم و خەفەتی نەکردوونە یەکجاریی و، سنووری بۆ هەموو شتێك داناوە. چاوەڕوانی ئەو سنوورە بە؛ چونکە وەك دەڵێن:هەر شتێك گەیشتە سنووری خۆی ، بۆ دژی خۆی دەگۆڕێت. دەستوورێکی باووڕێسایەکی جێگیرە لەژیاندا. تەنانەت هەڵامەتێکی تووشت دەبێت: سوور بزانە سنوورێکی هەیە و خوا یار بێ ، کۆتایی دێ، ئەو تایەی دەیگری، سنوورەکەی ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێکە و ئیدی وەك جاران ساغ وسەلامەت دەبیەوە، برسیەتیی سنوورەکەی تێریی و، هەژاریی سنوورەکەی دەوڵەمەندیی و، زیندان سنوورەکەی بەرهەڵبوون و ئازادیی و، خەم و خەفەت سنوورەکەی شادیی و خۆشییە؛کەواتە:چاوەڕێ بە و ئارام بگرە و قسەکەی پێشەوای زانا شێخ عەبدولعەزیز بن بازت لەبیر بێ : (( ئارام بگرە؛چونکە هەمووشتێك سنوورێکی هەیە)).

## با ژیانت سا دە بێ

لەگەڵ جەنابی شێخ ساڵح حەسین- ڕەحمەتی خوای لێ بێ – بووم کە سەرۆکی گشتیی مزگەوتی حەرام و مزگەوتی پێغەمبەر(**صلى الله عليه وسلم**) و، سەرۆکی گفتوگۆی نیشتمانییە و لەپلەی وەزیردایە و،هەر خوا دەزانێ چەندە زانا و شارەزا و تێگەیشتوو و بلیمەتە. تەماشامکرد لەجوانترین سادەیی و ئەو پەڕی بێفیزیدایە. سادەییەك هەر باس ناکرێت. سادەییەکی بێ زۆر لەخۆکردن و داسەپاندن و قووڵبوونەوە و خۆ پێوە ماندوو کردن. ئەویش بەهۆی هێمنیی و وەرگرتنی هەموو شتێك وەکو خۆی و، هاتنە مەیدان بەو پەڕی خۆشییەوە؛ بۆ کۆبوونەوە دێتە لامان بەبێ عەبا و پاسەوان وپاوەر،بەتاقی تەنێ! پێکەوە دانیشتنێکی بچووکمان هەبوو، ویستمان چا یان قاوە بخۆینەوە، هەستا ئەو بیهێنێ، پێمان سەیر بوو، سوێندمان لێ خوارد و دامانیشاندەوە. هەینییەك، پێش نوێژی هەینی،پێکەوە لەمەکەوە دەچووینە جەددە،کە قەراربوو لەوێ شا عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولعەزیز ببینین، هات وەکو پیاوچاکە هەژارە بێ فیزەکان سواری پاس بوو، یەکسەر ئەو ئایەتەم هاتەوە بیر: ((**وَ عِبادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنَاً** – بەندەکانی خواش ئەوانەن لەسەر خۆ بەسەر زەویدا دەڕۆن ))**الفرقان**( ٦٣ )، بەهێمنی دانیشت و زەردەخەنەی بەسەر هەمووماندا بەشییەوە... نە حەزی لە ڕیکلامە، نە خۆ بەگەورە نیشاندان، نەمەدح و

ستایش، نە زۆر لەخۆ کردن. ڕۆژی هەینی فرۆشیارێك ویستی سیواوکێکی بەدیاریی بداتێ، قبوولّی نەکرد، کیسە باخەڵی دەرهێناو پارەی دایە. ڕووی دەمن کرد و بە بزەیەکی دلگیری سۆزاویی پڕلەبەزەیی و بەخشندەیی و بێفیزیی، سەلامی لێ کردم و لەکاتێکدا پێش نیوەڕۆی هەینی بوو- پێی گوتم:یا شێخ، دەڵێی چی ئەوڕۆ بکەینە ڕۆژی سەلات و سەلامکردن لەسەر سەرداری مرۆڤایەتی **(صلی الله علیه وسلم)**؟!گوتم:زۆرم پێ خۆشە، ئیدی جەنابی شێخ سالّح بەشێوەیەکی ئەوەندە قوولّ و بەسۆزو حەزو تامەزرۆیی و گەرم و گوڕیی و بەئاگایی و ملکەچیی و بەندایەتیی و کاریگەر سەڵاوەتی لەپێغەمبەر**(صلی الله علیه وسلم)** دەدا، مچوڕکی بەدڵی مرۆڤدا دەهێنا. تەماشام دەکرد شێوازی ڕوخساری تەواو کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو سەڵاوەتانە، کە بەشێوەی جیاجیا بەدرێژایی ڕێگای نێوان مەککە و جەددە دووبارەی دەکردنەوە، جارێك دەیگوت: خوایە گیان، سەلات و سەلام بڕێژە سەر خۆشەویستەکەت و هەڵبژاردەی دروستکراوەکانت ودۆست و یارویاوەرت - موحەممەد- **صلی الله علیه وسلم**. جارێك دەیگوت:خوایە گیان، سەلات و سەلامی پێ بگەیەنە، پاشان سەلات و سەلامی ئیبڕاهیمی بەکار دەهێنا: ((خوایە گیان سەڵاوەت بڕێژە سەر موحەممەدو بنەماڵەی موحەممەد، وەکو چۆن سەڵاوەتت ڕژتە سەر ئیبڕاهیم و بنەماڵەی ئیبڕاهیم، بەڕاستی تۆ سوپاسکراو و خاوەن شکۆی، خوایە گیان، بەرەکەت بنێرە سەر موحەممەدو بنەماڵەی موحەممەد، وەکو چۆن بەرەکەتت ناردە سەر ئیبڕاهیم، بەڕاستی تۆ سوپاسکراو و خاوەن شکۆی))، ئیدی بەو جۆرە تا گەیشتینە جەددە. ڕێگا تەواو بوو، بەڵام بەڕاستی ئەو دیمەنە لەبەر نیگای بیرو خەیاڵم تا ئێستاش تەواو نەبووە و هەر ماوە. دیمەنی ئەو وەلییە دنیا بەکەمگرە خواپەرستە بێفیزە ،لە کاتی سەڵاوەتدان لە سەرداری مرۆڤایەتی – دایك و بابم بەقوربانی بێ- بەو جۆرە دڵئامادەیی و سامدارییە. لەڕاستیدا لەبواری دنیا بەکەمگریی و دۆستایەتی و خۆشەویستیی خواو سادەییدا، دەرسێکی مەزنی دادام! ئەو کاتە ناسیم کە سەرۆکایەتیی گفتوگۆی نیشتیمانیی دەکرد؛ ئەو کۆنگرەی وەزیران و زانایان و دکتۆران و ئەندازیاران بەشدارییان تێدا دەکرد، تەماشات دەکرد لەوێش لەپۆشاك وگوفتارو ڕەفتاریدا هەر هێمن و سادەوخاکیی بوو. لەسەر ڕێبازی ڕێو شوێنی پێغەمبەر**(صلی الله علیه وسلم)** و، بەبێ پێشەکیی و زۆر لەخۆکردن و قووڵبوونەوەو زمان لووسیی ودرێژدادڕیی، دەستی بەقسە کردن دەکرد. ژیاننامەی پێشەوایان: ئەبووبەکرو عومەرو عوسمان و عەلیی وەبیر دەهێنامەوە ، کە چۆن ژیاون! بەڵکو تەنانەت ژیانی ئەو کەسەی زۆر لەسەرووی ئەوانیشە، سەرداری مرۆڤایەتی**(صلی الله علیه وسلم)**، وەبیر دەهێنامەوە، **((وَ عِبادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنَاً..))الفرقان(٦٣ )** ، کەواتە بادەست لەزۆر لەخۆکردن هەڵگرین، با لەژیانماندا سادە بین، لەپۆشاکماندا سادە بین، لەشێوەماندا سادەبین، با سروشتی ژیان چۆنە، ئاوا بژین، با لەگەڵ خۆمان و خەڵکی دەوروبەرمان ڕێك و تەبا بین، بۆ ئەوەی ژیانمان خۆش وهێمن و پڕ لەدڵنیایی و شادیی و ئاسوودەیی بێت.

# لەسەر وەرزش و پیادە ڕۆیی بەردەوام بە بەختەوەر دەبی

لەشاری((میونیخ))ی ئەڵمانیا بۆ نەشتەر گەری ئەژنۆکانم ، لەلای دوکتۆر(قوتنی)ی ئەڵمانی مامەوە ، ئەو دوکتۆرە تەمەنی نزیکەی حەفتا ساڵ بوو،بەڵام لەو پەڕی هێزو چالاکیدا بوو، هۆیەکەشی وەرزش و پیادە ڕۆیی بوو،ئەو کابرایە هەر بەبازدان دەڕۆیشت وبەبێ هەڵکێش(**مصعد**)دەچۆ سەرێ.   کە خەریك بوو چاك ببمەوە، لەگەڵ ڕاهێنەرەکە بانگی دەکردم بۆ پیادە ڕۆیی و بەدیلمانج(**مترجم**)ەکەی دەگوت:پێی بڵێ وەك سەربازان بڕوات، فەرمانبەرەکانی لای ویشم دەدیتن  ئەو پەڕی چالاك و بەهێزبوون و،لەماڵەکانیانڕا بەپێیان دەهاتنە خەستەخانە،پاشان بەقاڵدرمەکان هەڵدەگەڕان ودەچوونە قاتی چوارەم کە خەستە خانەکەی لێ بوو.

بەڵام ئێمە هەر سواری هەڵکێش دەبین. بەڕاستی پێم سەیر بوو ئەوان هێندە بەهێزو تەندروست بوون و، ئێمەش ئاوا بێهێزو سست و خاو! هەمووشی ئیشی ئەوەیە کە ئێمە وازمان لەپیادە ڕۆیی هێناوە و، خۆمان ڕادەستی تەمبەڵیی و خاو و خلیچکیی کردوە. جا ئەگەر ویستت بەختەوەر بی و، خەم وخەفەتت بڕەوێنی، چالاکیت تازەکەوە و پیادەڕۆیی بکەو،کاتێکی تایبەتی بۆ وەرزش دانێ.  بەپێیان بڕۆ مزگەوت و، ئەگەر بازاڕ نزیك بوو، سواری سەیارە مەبە و بەپێیان بڕۆ و چالاکیی و جووڵەی لەشت تازە بکەوە.

زۆر بەی ئەوانەی تووشی شەکرەوفشاری خوێن وهەندێك نەخۆشیی دیکە بوون، بەهۆی دانیشتنی زۆر و کەمیی جووڵەو وەرزش نەکردنەوەیە.. بەپێیان بڕۆ، دەبووژێیەوە و ، بجووڵێ؛ چونکە جووڵە پیت و بەرەکەتی تێدایە.

## لەسەر بەڵاو ناخۆشییان سوپاسی خوا بکە، ناخۆشییەکان دەبنە دەستکەوت

یەکێك لەبرادەرەکانم – خوا شیفای بۆ بنێرێ – کە بۆ چارەسەر چۆتە شاری(ئیربید) ی ئەردەن، پێی گوتم: ئافرەتێکی هەژاری ئەردەنیی، پێنج کوڕی کەمئەندامی پێ بوون – هەموویان لەسەر کورسی بوون – لەبنکەیەکی تەندروستیی بەسەریانڕادەگەیشت، دەهاتە ژوور و دەچۆ دەرێ، هەر سوپاسی خوای دەکرد... لەکاتێکدا هەژارو نەداربوو، پێنج کوڕی کەمئەندامی هەبوون، کە نەیاندەتوانی بجووڵێن و لەسەر کورسیی بوون و، بۆ خۆی سەر پەرشتیی چارەسەری دەکردن وشەو نخوونیی لەگەڵ دەکێشان و، لەگەڵ ئەوەشدا بەسوپاسکردن و شوکرانە بژێریی خوای باڵا دەست و ڕازیبوون بەقەزاو قەدەرەکانی دەروون گوشاد و دڵخۆش بوو.. ئایا بەڵا هەیە لە بەڵای ئەو ژنە گەورەتر؟! نە مێرد، نە برا،نە باب، بەپێنج کوڕی کەمئەندامەوە کە جووڵەیان نییەو لەسەر کورسین، ئەوە سەرباری هەژاریی و دەستکورتیش، کەچی بەو پەڕی خۆشیی و سنگ فرەوانیی سەرپەرشتیی چارەسەریان دەکات! ئەوە چ ئیمانێکە کە بەردەوام لەهاتوچۆیدا هەر سوپاسی خوا دەکات! تەنانەت شتەکە ئەوەندە گەورە و سەیر بوو، برادەرەکەم لەوێڕا بە تەلەفۆن پێی گوتم ! خوا باشترین پاداشتی ئەو ئافرەتە ئارامگروسوپاسگوزارە بداتەوە و، ئۆقرە و ئارامیی بەسەردا ببارێنێ و عەوێزەی چاکتری بۆ بکاتەوە و، شیفای خێرا بۆ کوڕەکانی بنێرێت.

ئەو ئافرەتە، مەینەتبارە و لەبەر کوڕەکانی گیرۆدەی کارەساتەو، لەگەڵ ئەوەشدا بەئیمانێکی گەورە بەقەزاو قەدەر، سوپاسی پەروەردگاری دەکات وشوکرانە بژێرە، لەکاتێکدا چەندەها ئافرەتی دەوڵەمەندی خۆشگوزەران هەیە کە لەبەر بێ ئیشیی و سەر پێچیی و یاد نەکردنی خوای مەزن، بەخەم و خەفەت ونیگەرانیی ودڵە ڕاوکێیەوە دەژین، جا پەنا بەخوا !

## بۆ خۆت دەست بەئیشەکانت بکە

لەشارەکەمان، کە دەکەوێتە باشووری وڵات، پیرەمێردێك دەناسم تەمەنی نزیکەی سەدساڵە، باغێکی هەیە بۆ خۆی بەسەری ڕادەگات و مشووری کشتوکاڵەکەی دەخوات و،مەڕەکانی دەلەوەڕێنێ ودەیاندۆشێ و،بەپێیان لەماڵێڕا دەچێتە باغەکەی وبەچیا هەڵدەگەڕێ و، پێم شك نایەت قەت لەخەستەخانە خەوێنرابێت، یان نەشتەرگەری بۆ کرابێت، بەڵکو دەیبینم لەو پەڕی تەندروستیی و جموجووڵ و چالاکیی و شادیی و خۆشیدایە، ئەمەش بەهۆی جووڵە و ژیانی سروشتیی وبەسەر ڕاگەیشتنی ماڵات و کشتوکاڵەی بۆ خۆی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. ئەو پیرە پیاوە هەتا دەیبینم دەم بەخەندەوئارام وشادو بەکەیفە. یەك ڕۆژیش تووشی خەم و خەفەت و نارەحەتی نەبووە، بەڵکو چووبێتە هەر کۆڕو مەجلیسێك، خۆشیی و شادیی خستۆتە ناوی، قسەی حازر بەدەستە و بەردەوام نوکتان دەگێڕێتەوە، لەنێوان باغەکەی و ماڵێ لەهاتووچۆدایە، ئاوێ دەدێرێ، لەگەڵ مەلەکان گۆرانی دەڵێ، وەکو چوێلەکە و هەنگ و مێرووان،بەیانیان گورج بەرەو کێڵگە دەڕوات و،ئێوارانیش لەکاتێکدا بەدیمەنی کێڵگە جوان و دلگیرەکان دڵی پڕە لەشادیی و خۆشیی و،بەئاوی ساردو زوڵاڵ تێراوبووە و،تێر هەوای پاکی هەڵمژیوە و، چاوەکانی بەدیتنی دارودرەخت و بەرو بوومەکانیان ڕوون بوونەتەوە، دەگەڕێتەوە ماڵێ و، هەر کە گەڕایەوەش، هەر ئەوەندە کاتەی

هەیە نوێژێك بكات و، بەبیرێكی ئاسوودە و دڵێكی ئارامەوە لێی بنوێت.  ئیدی نە شەونخوونیی و نە بێخەویی و نەخەم و خەفەت! ئای لەو ژیانە هێمن و خۆشەی،كە هەر دەڵێی ژیانی پێشینانە، كە بەدەستی خۆیان ئیشیان دەكرد و كشتوكاڵ و ماڵاتیان ڕەنێو دەهێنا و ئاوردوویان پەیدا دەكرد و، هەموو ئیشێكی دیكەی پاكیشیان دەكرد! ئاخر خەم و خەفەت و بێخەویی و دڵە ڕاوكەی ئێمە، سەرچاوەكەی تەنها بێئیشیی كوشندەو سپاردنی ئیشەكانمانە بەخەڵكی دیكە.

## بەقەدەر هیمەتی خۆت سەركەوتن وەدەست دێنی

كاتێك سەفەرم بۆ لەندەن كرد، سەركەوتوویی بەڕێز(د. موحەممەد عومەر)، كە خەڵكی سۆماڵ بوو، سەرنجی ڕاكێشام،بەڕاستیی بەسەرهاتەكەی سەیر بوو؛دەیگوت:لە سۆماڵ لە ئۆردووگای پەنابەران بووم و، یەك وشەی عارەبیم نەدەزانی، ڕۆژێك شریتێكم گوێ لێ بوو، كە بانگخوازێكی سعوودیە، بەدەنگێكی بەرزو هەڵچوونەوە باسی (**لا إله إلاَّ الله**)ی دەكرد، ئیدی خۆشەویستیی زمانی عەرەبیم چۆ نێو دڵ و، چووم لەسەر دەستی یەك لەمامۆستایان فێری عەرەبیی بووم، پاشان چوومە پەیمانگایەك تا بەتەواویی فێربووم،پاشان قورئانم لەبەر كرد و چوومە لەندەن و شەهادەی دوكتۆرام وەرگرت. ئەو بەڕێزەمان لەمەڵبەندی ئیسلامیی سۆمالیان دیت، كە سەرۆكی مەڵبەندەكە و بانگخواز و وتاربێژو قورئان لەبەر و مامۆستاش بوو، خاوەن ڕەوشتێكی زۆر بەرزبوو. ئەوە بەسەر هاتی منداڵێكە لەنێو ئاوارادا دەژیا و، هیچی لەزمانی عەرەبیی نەدەزانی و، بێجگە لەپشتیوانیی خوا و هیمەتی بەرز، هیچ بنەمایەكی سەركەوتنی شك نەدەبرد.  ئەو بۆ خۆی هۆكارەكانی بەرزبوونەوە و هەستانی گرتنە دەست و، دەستی بەفێربوون و فێركردن و خۆپێگەیاندن كرد، تا سەرنجام بوو بە ئەستێرەیەكی گەش كە ڕووناكییەكەی سەرپاكی ئەو مەڵبەندەی داپۆشی. لەزۆر موحازەرەدا باسمكردوە و، تا ئێستاش هەر باسی دەكەم و قەت لەبیرم ناچێت، چونكە بەسەر هاتێكە لەبەسەرهاتەكانی سەركەوتن.. لەكاتێكدا گەلێك لاوی وا دەبینی لەخێزانی دەوڵەمەند و خۆشگوزەرانن و، هەموو هۆكارێكی فێركردن و سەركەوتنیان لەبەر دەستە، بەڵام تەواو تێشكاون و سەرنەكەوتوون. جا با هیمەتت بەرز بێ و خۆت لەلا بەنرخ بێ و ، بەدانیشتن لەسەر ئەستێران نەبێ، قایل مەبە.

گەر سەركێشیت كرد لە چیاو هەڵدێران          ڕازیی بە تەنها بە سەر ئەستێران

## وەك باڵندە خوێن شیرن و ڕووح سووك بژی

لەگوندەکەمان - لەباشوور- پیاوێکی بەتەمەن هەبوو، خۆی لەسەت ساڵ دەدا، زۆر خوێن شیرین و ڕووحسووك بوو، هەمیشە دەم بەخەندە و قسە خۆش بوو، لەهەر کۆڕێك ئامادەبا، هێندە گاڵتە چی و گفت لفت شیرین بوو، وەسەر خۆشیی و پێکەنینی دەگێڕا؛ بەردەوامیش لەڕیزی یەکەمی مزگەوت بوو.

بەوەی خوا پێی دابوو، زۆر ئاسوودە و بەقەناعەت بوو،خەفەتی بژێوی هەڵنەدەگرت،بۆیە هیچ نەخۆشییەك نەیخستبوو، هیچ نەشتەرگەرییەکی بۆ نەکرابوو، بەڵکو زۆر لەش سووك بوو،بۆ خۆی ژیانی خۆی هەڵدەسووڕاند و هاتوچۆی مزگەوت وکێڵگە و نێو خەڵکی دەکرد.  کە خەوی دەهات، دەنووست و، بەیانیش هەڵدەستا و دەچۆ سەر کێڵگەکەی، کە لەنێوان گردێك و شاخێکدا بوو، لەڕێگا بە زەردەخەنەوە سڵاوی لە هەموان دەکرد. لەگەڵ منیش نێوانی زۆر خۆش بوو، هەر چەند نزیکەی چل ساڵ یان زیاتریش، لە بابم گەورەتر بوو! بەڵام لەبەر ئەوەی لەبەر خوا یەکترمان خۆش دەویست و،هەردووکیشمان حەزمان لەگاڵتە و قسەی خۆش و نوکتەی پاك و ڕێ پێدراو بوو، هەتا دیتبام، چاوەڕوان بووم نوکتەیەك بگێڕێتەوە و، وەڵامی بدەمەوە! ئەوەی خۆش بوو کە بەو هەموو تەمەنەیەوە کە خۆی لەسەت ساڵ دەدا، دەگەڵ مە دادەنیشت و کۆڕەکانمانی پڕ دەکرد لەخۆشیی و شادیی- خوا لێی خۆش بێت – مەبەستم لەم قسەیە ئەوەیە کە بەگوێرەی سروشتی خۆت بژی و، بە بەشی خوا قایل بی و، قەناعەتت بە ڕۆزیی خۆت هەبێت و، زۆر لەخۆت نەکەی و، لەگەورە و چووك نزیك بی و،  خۆت بەسەر کەسدا هەڵنەکێشی و، خۆت لەخەڵك بەگەورەتر نەزانی و، لەگەڵ بەدیهێنراوەکانی خوا لەسروشتدا هاو ئاهەنگ و گونجاو بی و، جار جار بۆ سەر دەریا و گرد و شاخ و کێڵگە پیاسە بکەی، تاکو چێژ لەو نهێنییانەی خوای گەورە لەم گەردوونە دلگیرەی هاویشتوون، وەربگری و،وەك ئەو باڵندە بی بەڕۆزیی ڕۆژانەی خۆی قایلە،لەڕووباران ئاو دەخواتەوە و، بەری داران دەخوات و،پاك و بێگەردیی خوای تاك و تەنیا دەردەبڕێ.

## لا شەڕ بەو خۆت لە دوژمنایەتیی و تێکگیران لادە

موحەممەدی کوڕی ناسر عەجمیی ، زانای توێژەرەوەم ناسی؛ لەزانایانی کوێتە و، لەچەندان کۆڕو دانیشتندا دەگەڵی بووم؛ ئەو زانایە هەتا بڵێی لەسەر خۆ و نەرم ونیانە، هەتا بۆی بکرێ خۆی لەدوژمنایەتیی لا دەدات و، داوای ڕێککەوتن و هاوکاریی و ئاشتەوایی دەکات، بەخراپە باسی کەس ناکات و کەس بریندار ناکات؛ بەڵکو تەماشای لایەنە جوان و گەشەکانی ژیانی خەڵك دەکات، لەبەر ئەوە پێم شك نایە یەك دوژمنیشی هەبێت .

زیانی بۆ بەندەکانی خوا نییە، لەبەر ئەوە ئەوانیش زیانیان بۆ وی نییە، وەکو لە حەدیسدا هاتوە: ((مسوڵمان ئەو کەسەیە خەڵك لەزمان و دەستی سەلامەت بن)). خاتر جەم و دڵنیا بۆ خۆی سەر قاڵی ساغکردنەوەی کتێبەکانی زانست و سوود گەیاندنە بەقوتابییەکانی و، تەمەنی خۆی لەدوژمنایەتیی وشەڕو کێشەی خەیاڵیی بەسەر نەبردوە، بەڵکو لەگەڵ خۆی و خەڵکی تەبا ڕەبا بووە و ، بێ ئەوەی کەس بێزار بکات، ڕێی زانست وتوێژینەوەی گرتۆتەبەر، ئەگەر ئامۆژگاریی کردبێت، بەنەرم و نیانیی کردوویەتی و، ئەگەر قسەشی بۆ خەڵك کردبێت، بەلێزانیی

کردوویەتی. ئیدی لەئەنجامدا خەڵك لێی ڕازیی بووە و، هەموو كەس لەزمان و دەستی سەلامەت بوون و، دڵی خۆشەویست و برادەرەكانی وەدەست هێناوە.

## دار فرۆشیش بێ، ئیشێك هەر بكە

بێ كار دامەنیشە، دارفرۆشیش بێ، ئیشێك هەر بكە. ڕۆژێك چوومە بازاڕی میللیی ڕیاز، نێو كرێكاران وچەوساوان وخاوەن پیشەو وەستاكاران، بەڕاستیی خۆشحاڵ وشاگەشكە بووم؛یەك دارتاشیی دەكرد،یەك شتی دەچنی، یەك خەریكی بازرگانیی بوو،یەك فرۆشتنی سەوزەو میوە، یەك جلك وبەرگ،یەك كتێب... ژیان لەلای وان دەتگوت پوورە هەنگێكە! هەموو زەردەخە لەسەر لێو، قاقا پێدەكەنین، شادو دڵخۆش، چونكە لەكەش و هەوایەكدا بوون، سەر پاكی ئیش و جووڵەو چالاكیی بوو، ئەو پیشە جۆراوجۆرانە ژیانی ڕۆژانەی دابین دەكردن و، لە دەست پانكردنەوە لەخەڵك دەیان پارازتن و، شەرەف و ئابرووی پاك ڕادەگرتن. ئەوەی لەوێ دیتم، قوتابخانەیەكی بچووكی تێكڕای ژیانی دنیا بوو، بەو پیشە و كارانە ژیانی شەرەفمەندانە دێتە دی؛چونكە بۆشاییەكی تێدا نییە جێی قسەو قسەلۆك و قسەی پاشەملەو دووزمانیی تێدا ببێتەوە. دوای ئەوە سەردانی پێشانگای خێزانە بەرهەمهێنەرەكانم كرد؛كە بازاڕێكی دیكەیە هەر لەشاری ڕیاز ، لەوێ بەشی ئەو ژنانەم دیت قاوە و چاو زەنجەبیل و یانسۆن و نەعنا وشیرنیات و ساردەمەنی و موقەبیلات و، خواردنی میللییان دروست دەكرد، خەڵكیش كۆمەڵ كۆمەڵ ڕیز بوو بوون، لێیان دەكڕین، ئەوانیش بەدڵی خۆش شوكرانە بژێریی و سوپاسی خوایان دەكرد،چونكە كارو پیشەیەكی بۆ هێناونەتە پێش ، ڕۆزیی خۆیانی لێ پەیدا دەكەن!

با ئەو كچە بچووكانەشم لەبیر نەچن لە هێنانی بەفركەر(**ثلاجة**) و ترمزو، بەرهەمی دەستی وشیرینی و شتگەلی لەماڵێ دروستكراو پارمەتیی دایكە بەتەمەنەكانیان دەدا، بەڕاستی دیمەنێكی جوان وسەرنجڕاكێش بوو! لەوێ تێگەیشتم خوای گەورە، هەر كەسێك داوای لێ بكات و بجووڵێت و كار بكات، ڕزق و ڕۆزیی دەدات، بەڵام ئەو كەسەی لەماڵێ دانیشێت ، چاوەڕێ بێت، ڕۆزیی بۆ بێت، ئەوە عەقڵی تەواو نییە و، پشت بەخوا بەستن و هیمەتی ناتەواوە و، سەرەنجام لەبەر ئەوەی نائومێد و بێكار دانیشتوە، خەم وخەفەت تووشی شەكرەوفشاری خوێن (زەخت) ی دەكات و،تەندروستیشی تێكدەچێت.

كەواتە:خەڵكینە، بڕۆنە دەرێ، هەرچەندە چوونە دەرتان تەنها بۆ داركردن لەشاخانیش بێت، وەكو لەحەدیسدا هاتوە:((ئەگەر هەر كامێكتان كۆڵە دارێك بەپشتی بێنێت، لەوە چاكترە داوا لەخەڵكی بكات، داخوا بیداتێ، یان نەیداتێ! )). بڕۆن ڕۆزیی خۆتان پەیدا كەن، بگەڕێن، لە هەموو دەرگایەكی گونجاو و

ڕێگە پێدراو بدەن و، هەموو پیشەیەكی شەرەفمەندانە تاقی بكەنەوە؛چونكە ئاسمان زێڕو زیو نابارێنێ!

## لەگەڵ خەڵك نەرم و نیان بە، دەچییە نێو دڵیان

بەگەنجیی کە وتارەم دەدان،وەکو زۆربەی گەنجان، جۆش و خرۆش و توندو تیژیی بەسەر وتارەکانمدا زاڵ بوون، تەماشام دەکرد ئەو کەسانەی ئامادەی دەرسەکانم دەبوون، یان گوێیان لەوتارەکانم دەگرت،پشتم تێدەکەن و لێم لا لووت دەبن ودوور دەکەونەوە! پاشان بۆم دەرکەوت هێمنی و نەرم و نیانیی و، زمان شیرینیی و ئاسانکاریی، باشترە،لەبەر ئەوە هاتمەوە سەر ئەو ڕێبازە و، ئەو جار خەڵك- سوپاس بۆ خوا – بە ئاسوودەیی گوێیان بۆ دەگرتم ودوعایان بۆ دەکردم و ستایشیان دەکردم. ئیدی زانیم ڕاسترین ڕێ ئەوەیە:لەپێشدا دڵی خەڵکی وەدەست بێنی؛ چونکە قسەت نەرم نەبێت و،لەجیاتی سەختگیریی ئاسانکاریی نەکەی و،لەجیاتی دڵ ئێشاندن، خەڵك دڵخۆش نەکەی،نەکەس گوێت لێ دەگری، نە سوودت لێ وەر دەگری! جا وەسیەتم بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ کاریگەر بێ ،یان بانگخوازبێ ، یان پەروەردەکار بێ،یان مامۆستا بێ،ئەوەیە کە ڕێی حیکمەت و لێزانیی و نەرم و نیانیی دەگەڵ خەڵکی بگرێتە بەر؛چونکە((نەرم و نیانیی لەهەر شتێکدا بێت، جوانی دەکات ونەرم و نیانیی لەهەر شتێك دابرێت، دزێوی دەکات)). شێوازی سەختگیریی و دڵ ئێشاندن وەلانێن؛ چونکە شێوازێکی خراپ وشوومە و، تەنها ڕق وقینی لێ پەیدا دەبێت و،خاوەنەکەشی دەکاتە نیشانەی تیری بوغزو کینەی خەڵك. جا بەقسەیەکی چاك و ، بزەیەکی بەسۆزو مژدە و گەشبینیی، دڵی خەڵکی وەدەست بێنن. ڕەفتاری چاك دەروو لێکرانەوەی بەندەیە لەلایەن خواوە و، هەر کەسێك ڕەفتاری چاك و نەرم و نیانیی پێ برابێت، ئەوە خێروچاکەیەکی زۆری پێ براوە.

## لە ڕووداوەکان مەترسە؛ چونکە هەموو کارو بارێك بەئەندازەی خۆی دێتە دی

ئەو کاتەی لەفلیپین تەقەم لێ کرا، شەش گوللەیان پێوە نام؛ سێم وێ کەوتن و ڕزگارم بوو، بەئەمری خوای بەسۆزو لێزان، سێشم وێ نەکەوتن و، ئەو کەسەی تەقەشی لێ کردم، دەست بەجێ کوژرا.

ئەو چەکیشی پێ بوو، کوژرا، ئەمنیش بەبێ چەکیی، خوا پارازتمی و نەکوژرام. ئەوە تەنها توانا و دەستەڵاتی خوای وەدیهێنەر و باڵایە، لەبەر ئەوە لەڕووداوەکان مەترسەو، قسەی خوای گەورە بلێوە: ((**قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا** – تەنها ئەوەمان تووش دەبێت کە خوا بۆی نووسیوین)) **التوبة** (٥١) ، جا پێویستە خۆت بەخوا بسپێری و بەفەرمانی ڕازیی بی و، بە دوعای شەرعیی و زکرەکان، بەتایبەتی زکرەکانی بەیانیان و ئێواران ، خۆت بپارێزی و، بڕوات بەوە هەبێ کە لەژێر سایەی چاودێریی و پشتیوانیی و نزیکیی و پاراستنی خوا دای.

ئایا لەو باوەڕەدای پێش کاتی خۆت بمری؟ یان بەشێك لەڕۆزی خۆت لەقیس بچێت؟ کاروبارەکان لەجوغزی قەزاو قەدەردا، لەلایەن خواوە بەڕێوە دەبرێن و، هەر شتێك لەسەر زەوی ئەنجام بدرێت،ئەوە لەلایەن خواوە بڕیاری

لەسەر دراوە. جا سینگت فرەوان و، خەیاڵت ئاسوودە کە و، پشتت بەپەروەدگار ببەستە و، کاروباری خۆتی پێ بسپێرە و،متمانەت بە کار ڕاپەڕاندنی هەبێت و، بەفەرمانی ڕازی بە،بەختەوەر و سەلامەت و سوودمەند دەبی.

## لەیەك کاتدا تەنها یەك ئیش بکە

ئەو کاتەی لەکۆلێجی بنەڕەتەکانی ئایین لەشاری ئەبها مامۆستا بووم، بەئەزموونێکدا تێپەڕیم، ئەویش ئەوە بوو،کە زۆر تامەزرۆ و دڵگەرمی فێربوونی زانست بووم، لەبەر ئەوە کتێب گەلێکی زۆرم لەکتێبخانەکەمدا کۆکردەوە، پاشان کاتی نێوان نوێژی عەسر و نوێژی خەوتنانم بەسەر بابەتەکاندا دابەشکرد،بەحیساب لەمەودوا لەهەر بابەتێکی بەخەیاڵمدا بێت، دەبمە دەریا!  ئیدی هەر بابەتەی دە خولەکم بۆ دانا(تەفسیر دە خولەك، حەدیس دە خولەك، شەریعەت دە خولەك، ئەدەب دە خولەك، مێژوو دە خولەك، بنەماکنی شەریعەت دە خولەك... هەموو بابەتەکانی دیکەش بەم جۆرە).بۆ هەر بابەتێکیش لەوانە، کتێبێکم هەڵبژاردبوو؛ بۆ نموونە: لەتەفسیردا، ئیبن کەسیر؛ لەشەریعەتدا ، موغنی؛ لەمێژوودا، مێژووی خەلیفەکان ، ئی سیووتیی؛ لەئەبدا دیوانی موتەنەببی و... هتد. بەڵام تووشی شەپرێویی و گێرەو کێشەیەکی زۆر بووم؛ بیرم پەرت و بڵاو بوو، تووشی نیگەرانیی و بێ سەرەو بەرەیی هاتم؛ چونکە لەڕووی کات و کتێب و بابەتەوە، سنوورو شێوازو ڕێبازو کۆت و بەندێکی زۆرم بۆ خۆم دانابوو.  سەرەنجام هیچ فێر نەبووم؛ چونکە لەخوێندنەوەدا زۆرم لەخۆم دەکرد، پاشان تێگەیشتم دەبێ بێ زۆر لەخۆ کردن و خۆ تێکدان، بگەڕێمەوە سەر سروشتی ئاسایی خۆم. ئەگەر دەستم بەخوێندنەوەی حەدیس کرد، دەبێ لەسەر خۆ بیخوێنمەوە، ئەویش زۆر بەبیر چڕ داگرتن(تەرکیز) و بایەخ پێدانەوە، وەکو بڵێی لەو بابەتە بترازێ، هیچی دی نازانم!  ئەگەر تەفسیریشم خوێندەوە، هەموو بابەتێك لەبیری خۆم بەرمە دەرێ و، هەموو بیرم بخەمە سەر ئەو بابەتە. جا بەگرتنە بەری ئەو ڕێبازە لەبارو گونجاوە، بەدڵێکی کراوە و زۆر سادە و ئاسان، فێربووم و سوودێکی زۆرم وەرگرت. جا خۆت پەرت و بڵاو مەکە و، بایەخ و بیرت کۆبکەوە و، بە کردنی چەند کارێك لەیەك کاتدا، گیانی خۆت هەلا هەلا مەکە. لەیەك کاتدا هەر یەك ئیش بکەو، بیری خۆتی لەسەر چڕکەوە و بەچاکیی بەکاری بێنە و، بەردەوام ئەو حەدیسە لەبەرچاو بگرە: ((**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ** – هەڵبەت خوای گەورە پێی خۆشە هەر کامێکتان کارێکی کرد، بەڕێکوپێکیی بیکات)) **رواه الطبراني ، قال الألباني في السلسلة الصحيحة**(١٠٦/٣)

# خراپەی بەدکاران بە خراپە وەڵام مەدەوە و خەڵکی حەواڵەی خوا بکە

سەرەتا کە دەستم دایە بانگەوازکردن بۆ خواو وتاردان، هەر کەسێك ڕەخنەی لێ گرتبام، یان گاڵتەی پێ کردبام، بەرپەرچم دەدایەوە. ئەگەر شیعر با، بەشیعر،وتار با، بەوتار و، لە هەموو دەرفەتێکدا((قوززەڵقۆرتم لەجێی سندان دادەنا و، وام دەزانی ئەوە ئازایەتییە و، دەبێ هەر وا بکەم و،ئەوە نیشانەی بەهێزیی و سام و شکۆی منە! بەڵام لەنەکاو هەستم کرد دوژمنم هەر زۆر دەبن و لەبانگەواز و زانستخوازیی و فێرکردنم دادەبڕن و، بەخۆیانەوە سەرقاڵ دەکەن؛بۆیە گەڕامەوە سەر ڕێبازی قورئان: ((**إِدفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذا الَّذي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ** – بەشێوەی هەرە چاك پاڵ بەخراپەوە بنێ، ئەو کاتە تەماشادەکەی ئەو کەسەی لەنێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتیی هەیە، وەکو دۆستێکی نزیکی لێ دێت )) **فصلت** ( ٣٤ ) . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ((**فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الجَمِيْلَ** – جا لێخۆشبوونی جوان ئەنجام بدە)) **الحجر**( ٨٥ ). هەروەها فەرموویەتی: ((**وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاماً** – ئەگەر نەزانەکانیش قسەیان دەگەڵ کردن ، دەڵێن: بڕۆن؛ هەر یەکەمان بەڕێی خۆیدا))**الفرقان** ( ٦٣ ). لەبەر ئەوە دەستم لەوەڵامدانەوەی خەڵك هەڵگرت و، سەرقاڵی زانستخوازیی و بانگەواز بووم، ڕەخنە گرەکانیش کەمیان کردەوە و،وای لێ هات کەس گوێی نەدەدایە ڕەخنەکانیان و باسیان نەدەکردن؛زانیم ئەمن بەوەڵامدانەوەیان یارمەتیی بڵاوکردنەوەی ڕەخنەکانیانم داون و، بەو هۆیەوە ئەو کەسانەی بە ڕەخنە و گاڵتە و جنێوەکانیشیان نەزانیبوون، پێیان زانیون. بەڕاستیش ئەو ڕێبازە بێسوودە؛چونکە دەتکاتە جنێو فرۆشێکی زمانشڕ، کە ئیش و کاری وەڵامدانەوەی هەڵەو ڕەخنەی کەسانی دیکەیە، بەڵام ئەگەر بتەوێ زانستییانە وەڵام بدەیەوە،دەبێ سوود لە خەڵکی دیکە وەربگری و توێژینەوە بکەی و پێ لە هەڵەکانت بنێی و، وەڵامەکەت زانستیی و پتەو بێت. دەبێ بایەخ بەزانیاریی وبیرەکەی بدەی، نەك ڕەخنەی کەسیی؛ چونکە ئەو کارە ژیان وکات و سەلامەتیی و ئارامیت بەفیڕۆ دەدات و، بەردەوام بیربڵاو و شپرزە دەبی و، سەرەنجام دەبیە قوربانی ئەو کەسانەی وەکو مێش تەنها لەسەر برین دەنیشن، ئەوانیش خەمی هیچیان لەبەر نییە ئەوە نەبێ بەدوای هەڵەو عەیب و عاری خەڵکدا بگەڕێن.

## لەسەر حیسابی تەندروستیی و کات و ئاسوودەیی خۆت دڵی کەس ڕامەگرە

لەسەرەتای لاویمدا زۆر دڵی خەڵکم ڕادەگرت، تا کەس ڕەخنەم لێ نەگرێ، لە هەموو بۆنەیەك ئامادە دەبووم؛ ئەگەر برادەرێك بۆ ژنهێنان، یان بانگهێشت(دەعوەت)، یان هەر بۆنەیەك بانگی کردبام، دەمو دەست دەچووم. بۆ هەموو بۆنەیەك دەچووم؛ زۆربەشیان قسەی بێسوود و وڕێنە و فشقیات بوون، ئیدی کات و تەمەنم بەفیڕۆ دەچوو و،هەموو جارێ لەبەر ئەو بێسەرەوبەرەیی و ژاوە ژاو وقسە بێنرخانەی دەمبیستن، بەدڵتەنگیی دەگەڕامەوە. لەدوای چەندان ساڵ بیرم کردەوە، ئەمن لەو بۆنانە و لەو بەدەنگەوە هاتنی بانگکردنانە، بێجگە لەخەم وخەفەت و لەدەستچوونی زانست و کات بەفیڕۆ دان ودڵتەنگی، هیچم وەدەست نەکەوتوە؟ پاش ئەوە ڕەوتی ژیانی خۆم گۆڕیی و،لەسەر مەوعیدەکانم سووربووم و،لەو ئەرکانەی دەقەکانی شەرع داوایان دەکردن،ئامادە دەبووم؛ وەکو: سەردانی نەخۆش، دڵدانەوەی بابای کارەسات بار، یان بۆنەی ژنهێنان، هەمووشی لەکاتێکی دیاریکراودا و، پاشان زوو دەچووممەوە ماڵێ. زۆربەی ئەو مەوعیدە کۆمەڵایەتیی و بۆنانەشم واز لێهێنان کە تەنها مایەی کات بەفیڕۆدان و دڵتەنگیی و، لەدەستچوونی زانست و،ڕۆیشتنی خێروچاکە و زیادبوونی خراپەو تاوان بوون. جا لەسەر حیسابی دینەکەت، ئاسوودەییەکەت، ئاسایشەکەت، ئارامییەکەت، دڵی کەس ڕامەگرەو،لەبڕیارداندا پێ داگرەو یەك قسە بە. نووسەرێکی ڕۆژئاوایی کتێبێکی نووسیوە بەناوی((کەنگێ دەڵێی: نا؟))؛ کەباسی ئازایەتیی گوتنی((نا)) دەکات؛ چونکە تۆ ئەگەر خۆت یەکلاکردەوە و، بڕیاری خۆت دا و،زانیت ئەو کاتەی هەتە، بەشێکە لەژیانی تۆ و لێپرسینەوەت لەسەری دەگەڵ دەکرێت و، بەکردەوەکانمان خولەك و چرکەکان، بەتاڵانکردن تاڵان دەکرێن،قایل نابی بەخۆڕایی بەسەر خەڵکی بێکارو زمانبازو بێ ئاگادا کاتی بە نرخی خۆت دابەشبکەی. کەوابوو:کاروباری خۆت ڕێکخە و، وەدوای ئەو دڵڕاگرتن و دڵ چاکردنەوانە مەکەوە، کە لەتەمەن بەفیڕۆدان لەقسەو قسەلۆك و وڕێنەو قسەی پووچ بەدەر، هیچیان لێ ناپشکوێتەوە!

## بەرانبەر ڕەوشە جیاوازەکان، هەر وەك خۆت بە

لەگەڵ مامۆستایەکی زانکۆیەکی عەرەبی- کەبۆ چالاکییەکانی جەنادریە هاتبوو- چووینە کن شا سەلمانی کوڕی عەبدولعەزیز، کە ئەو کاتە میری ڕیاز بوو، مامۆستا لەتەنیشتم دانیشتبوو، شا سەلمان لەحاڵ و باڵی پرسی، مامۆستاش گوتی:حاڵم جاری وایە باشە و جاری واشە خراپە! شا سەلمانیش پێی گوت:لەسەر یەك ڕەوش بە . وەکو

موتەنەببی دەڵێ: **حالات الزمان عليك شتًّى — وحالك واحدٌ في كلِ حالٍ**

**زەمان ڕەوشی جیا دێنێتە گۆڕێ — تۆ وەکو خۆت بە ڕەوشت نەگۆڕێ!**

گەڕامەوە ماڵێ و ئەو دێڕە شیعرەی موتەنەببیم دەگوتەوە؛ چونکە مەعنایەکی تازەم لێ هەڵکرِاند؛ئەویش ئەوە بوو کە دەبێ بەئارامیی و خۆڕاگریی ڕوو بەڕووی ڕووداوەکان بینەوە و، لەخۆشیی و ناخۆشیدا بەندەی خوا بین و، هەرچەندە ڕەوشەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت، پێویستە سەبرمان هەبێت وچاوەڕوانی پاداشتی خوا بین و، لەبەرانبەر ڕووداوەکان نەڕووخێین؛ چونکە خوای گەورەمان لەگەڵە و،ڕەوشی باوەڕداری ڕاستەقینە هەر چۆنێك بێ، ناگۆڕێت؛چونکە لەخۆشی و ناخۆشیی و تەنگانەوفەڕحانی و، دەوڵەمەندیی و هەژاریی و لە ماڵێ ولە سەفەردا، باوەڕ و متمانەی بە خوا هەیە.

چەندە پێویستمان بەوەیە بەردەوام ئەو دێڕە شیعرەی موتەنەببی بخوێنینەوە و لەژیانماندا جێ بەجێ ی بکەین!

کەواتە: لەسەر یەك ڕەوشی ڕەزامەندیی و دڵ دامەزران و ئارام و تەماداریی پاداشتی خوابە؛ چونکە ئەوەی خوا نووسیبی، هەر دێتە دی وئەتۆ ناتوانی قەزاو قەدەری خوا بگۆڕی و، مەرەکەبی نووسینی پێشهاتی تۆ، وشك بۆتەوە و، ئەو حەدیسەی پێغەمبەر(**صلى الله عليه وسلم**) وەبیر خۆت بێنەوە : ((ئیش و کاری بڕوادار سەیرە؛ بەڕاستی هەموو کاروبارێکی هەر خێرو چاکەیە، ئەمەش تەنها بۆ باوەڕدارە، تووشی خۆشی بێت، سوپاسی خوا دەکات و خێری بۆ دەنووسرێت، تووشی ناخۆشیش بێت، ئارام دەگرێت و هەر خێری بۆ دەنووسرێت)) . کەواتە: لەهەموو سات و کاتێکدا لەسەر یەك ڕەوش و بەندەی خوا بە و، فەرمانەکانی بەڕەزامەندیی وەربگرە، چونکە تۆ نازانی خێر لەچیدایەو،بژاردەی خوا بۆ ئێمە لەبژاردەی خۆمان باشترە.

## گومانی چاکت هەبێت و، وا مەزانە دنیا لێت لەفێڵە !

زانستخوازێکی جێ متمانە لەجەنابی شێخ عەبدولعەزیز کوڕی بازەوە — ڕەحمەتی خوای لێ بێ — بۆی گێڕامەوە، کە کابرایەك جارێك تەلەفۆنی بۆ کردوە، دیارە شێخی بێزار کردوە، جا دوای ئەوەی لە تەلەفۆنەکەی بۆتەوە و سەماعەکەی داناوە، گوتوویەتی: یەکەم ڕاستی کردوە(مەبەستی موتەنەببیە):

**إذا ساءَ فعلُ المرءِ ساءت ظنونه — وصدَّقَ ما يعتادُهُ مِنْ تَوَهَّمِ ..**

**گومانی پیسە مرۆڤی بەدکار — خەیاڵی گلاوی دەکاتە کردار**

دیارە شێخ بەد گومانیی و کەم ئەدەبیی لەو کابرایەدا دیتوە، بۆیە ئەو دێڕە شیعرەی خوێندۆتەوە.هەڵبەتە ئەو دێڕە شیعرە پەند و حیکمەتی تێدایە؛ چونکە بابای بەدکار، بەد گومانیشە و، ئەوەی ڕێگەی هەڵە و گومڕایی

گرتبێتە بەر، وا دەزانێ هەموو کەس وەکو ئەوە! کەواتە: گومانی خراپ بەخەڵکی چاك مەبە و، ئەگەر کارەکەی خۆت بەچاکیی کرد، نیەتیشت چاك دەبێت و، دەرهەق بەخەڵکیش گومانت چاك دەبێت، چونکە پیرەمێرد گوتەنی:

نیەتت چاك بێ ، ئیش دەبەیتە سەر — درەخت زڕ نەبێ، هەر بۆت دێتە بەر

دیارە خەڵکی بەڕێزو حورمەت بەردەوام گومانی چاکیان دەرهەق بەخەڵکی هەیە و، بەزۆریی لەخەڵك دەبوورن وچاوپۆشیی لە هەڵە و کەموکورتیی دەکەن. بەڵام بابای بەدکارو خراپ، بەرانبەر خەڵك گومانی خراپە و، تێڕوانینی دەربارەیان لەوپەڕی خراپیدایە و، هیچ عوزرێکیان لێ قبووڵ ناکات و، لەهەڵەکانیان خۆش نابێت؛ چونکە بە پێوەری دڵ و دەروونی خۆی دەیانپێوێ و کورد گوتەنی: ((لەدز وایە هەموو کەس دزە)): جا سینگی خۆت فرەوان کە و، خەیاڵت ئاسوودە کەو، پێت وانەبێ خەڵك پیلانت لەدژ دەگێڕن و، هەموویان بەمن و تۆوە خەریکن؛ چونکە کەمیی نان لەماڵی هەر کامێکیان، مردنی من و مردنی تۆشیان لەبیر دەباتەوە! پشت بە خوا ببەستە و، کاروبارت حەواڵەی خوا کە و، بە فێڵ و پیلانی خەڵك دڵتەنگ مەبە و، بەجوانیی لەخەڵکی خۆش بە و، هەمیشە سەیری لایەنە جوان وچاکەکانی ژیانی خەڵکی بکەو، ئەم دێڕە شیعرەی موتەنەببی وەبیر خۆت بێنەوە:

**ليس الغَبيُّ بسيدً في قومِهِ — لكن سيد قومه المتغابي**

**گێل بۆ گەلی خۆی نابێتە گەورە — خۆ گێل کردووە سەردار لەم دەورە**

## لە نێو جەرگەی گەردەلوولدا پێبکەنە

ئای لەو دوو دێڕە شیعرە جوانە، چەند شاکارو سیحراوین! لەو دوو دێڕەدا موتەنەببی ستایشی سەیفوددەولە دەکات، ئەو کاتەی بە دەستی خۆی، بەبزە و پێکەنینەوە شەڕی دەکرد و، سەرەکان دەپەڕین و، ڕووحەکان بە سەری ڕمەکانەوە بوون:

**وقفتَ وما في الموتِ شكٌّ لواقفٍ — كأنَّكَ في جفنِ الرديِّ وهو نائمُ**

**تمرُّ بك الأبطالُ كامي هزيمةً — ووجهك وضَّاحٌ وثغرُكَ باسِمُ**

**وەستاوی و وەستاو دەمرێ بێگومان — لەپێڵووی مەرگی نوستوودای، ئامان!**

**پاڵەوان هەڵدێن بریندارو بەزیو — تۆش بەبریندارىی ڕووخۆش و خەندان!**

ئای لەو وێنە هونەرییە دلگیرە! لەو دەربڕینە جوانە! لەو شاکارە شیعرە! کەواتە: تۆئەو پیاوە بە؛ با لەچاوی گەردەلوولدا بزەت بێتێ و پێبکەنە، باوەڕت بە پەروەردگاری خۆت هەبێت؛ ئایا ئەو زاتەی هەموو شتێکی بە دەستە،لە دایك و باوکت دەرهەق بەتۆ بە بەزەییتر نییە؟! ئایا ئەو خوایە هەمیشە جوانترین و چاکترین شتت بۆ هەڵنا بژێرێ؟! کەواتە: بەقەزاو قەدەری قایل بە و، بە بزەوە پێشوازیی لە هەڵبژاردنەکەی بکە؛ نەخۆشت بکات،

هەڵبژاردنە و، هەژارت بکات، هەڵبژاردنە و، چ پێشت خات، چ دوات خات، بەفەرمانی پەروەردگاری زەویی و ئاسمان هەر ڕازیی بە.. تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە چاوەڕوانی ڕوحمی خوا بکەی و، لە بەزەیی خوا نائومێد مەبە.. ((إِنَّهُ لا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللهِ إلاَّ القَوْمُ الكافِرُونَ - چونکە بێجگە لەکۆمەڵی کافران، کەس لەڕەحمەتی خوا نائومێد نابێت)).

چەند جار هەموو ڕێگە یەکمان لێ گیراوەو، کاروبارمان لێ تێکچووەو سەری دنیامان لێ وێکهاتوە، لەپڕ دەروومان لێ کراوەتەوە و تەمی ناخۆشیی ڕەوییوە، ((فَإِنَّ مَعَ العُسرِ يُسراً ، إِنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً – چونکە هەمیشە تەنگانەو ناخۆشیی، خۆشییان دەگەڵە. بێ گومان تەنگانەو ناخۆشیی خۆشییان دەگەڵە)) **الشرح** ( ٥،٦ ) . کەواتە: دڵتەنگ مەبە و، گومانی خراپ لەدەوروبەرت مەکە و، پشت بە خوا ببەستە و، کاروباری خۆتی پێ بسپێرە و،متمانەت پێ هەبێت؛چونکە خوای بەرز و باڵا پشتی دۆستەکانی خۆی بەرنادات و، بەندەکانی لەبیرناکات، ئەو زانا و شارەزایە و، دەزانێ کەی کاتی خۆشیی دوای ناخۆشی و، فەرحانیی دوای تەنگانەیە، جا بە بژاردەی خوا ڕازیی بە و، چاوەڕوانی هەموو بەخشندەییەك بە لەخواوە و، هاونشینی بەزەیی و نزیکیی خوا بە، دڵخۆشیی و ئارامیی و دڵنیایی و ئاسوودەییت دەستدەکەوێت.

## بێفیزبە دڵی خەڵکی وەدەست دێنی و خوا بەرزت دەکاتەوە

لە میوانداریی شێخی زانا(موحەمەد شامی شەیبە)ی موفتیی جازان بووم، بە نەرمونیانیی و خۆش مەشرەبیی و بێفیزییەکەی، کەمەندکێشی کردین، تەماشامکرد خەڵك، وەك چۆن پوورە هەنگ لەباخچەی ڕازاوە و بێستانی بۆنخۆش دادەوەرێن، ئاوا لێی دادەوەرێن، ئەویش مەرحەبای گەورە و چووك دەکات و، وەك بابی خۆی گەرم و گوڕ ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی بەتەمەن دەکات و، لەگەڵ هاوتاکانیشی وەکو برا و، لەگەڵ منداڵانیش وەکو کوڕی خۆی.

لەکۆڕەکانیدا، خەڵکی ڕەمەکیی بەتەمەن کە دێن، لەبەریان هەڵدەستێ و بایەخیان پێ دەدات و، بەبزە و ڕووخۆشیی دەیاندوێنێ و، لەحاڵ و باڵ و وردەکاریی ژیانیان دەپرسێت،کە گەنجەکانیش دەچن، بە دڵ و گیان ڕوویان تێدەکات، پاشان ڕوو دەکاتە منداڵان و، ماچیان دەکات و گاڵتەیان دەگەڵ دەکات... لەو زانا خواییەوە، خوو و ڕەوشتی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**)م وەبیر هاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە بابەتی هەقدا بەسامە، کاتی خۆی قازییەکی شێلگیر بوو، لەسەر هەق و ڕاستیی، گوێی بەسەر کۆنەی کەس نەدەدا، دەرسەکانیشی بەرێکوپێکیی دەڵێتەوە و، لەئاشتەوایی و ڕێکخستنەوەی خەڵك و وتار و فتواداندا سوودێکی زۆری بۆ هەموو لایەك هەیە. بەڵام ئەو خەسڵەتەی لەو زانایەدا کەمەندکێشی کردم، بێفیزیی و دڵنەرمیی و نزیکیی لەخەڵکی بوو. جا پێویستە بەرەو خەڵك بڕۆی و لێیان نزیك بییەوە، پەردەی زۆر لەخۆکردن(**تکلّف**)و خۆهەڵکێشان و لەخۆبایی بوون وخۆ

بەگەورە زانین هەڵماڵێ؛چونکە خوا ڕقی لەخەڵکی لووتبەرز و بەفیزە و، ڕیسوا و ملکەچیان دەکات و، هەر کەسێك لەبەر خوا خاکی و بێ فیزبێت، بەرزی دەکاتەوە.

## بازرگانیی بەقازانج لەگەڵ خوا

لەڕیازەوە بەرەو جیددە سواری فڕۆکە بووم، تەماشام کرد پیاو چاکێکی بازرگان لەتەنیشتم دانیشتوە، بە شێوە بەپیاوی چاکم زانی و خواش چاکتر دەزانێ، پێکەوە بەڕێوە دەستمان بەقسان کرد، وەکو چەندان ساڵ بێ یەکدی بناسین؛ باسی یەکتر خۆشویستن لەبەر خوا و کاری خێروچاکەمان دەکرد،زانیم ئەو پیاوە شارەو شار بەدوای مزگەوتە کۆنەکاندا دەگەڕێ، نۆژەنیان کاتەوە و پڕ فەرشیان کات و دەستیان پێدا دێنێ، ئیش و کاری ئەوەیە مزگەوتێکی کۆن لەشوێنێك بێت، نوێکردنەوەی بوێت،بیدۆزێتەوە. کە بۆ هەندێك لەبرایانم باسکرد، گوتیان: ئەوە بە نوێکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتان بە ناوبانگە، خوا ماڵێکی لەبەهەشت بۆ دروست بکات. چوومە پارێزگای عەفیف، سەردانی(بەلەد) ی شاری ئەوپیاوەم کرد، سەیرم کرد هەموو مزگەوتەکانی نۆژەن و ئاوەدان کردوونەتەوە، لەکۆڕێکدا کە دانیشتبووین، باسی کرا؛هەموو دوعایان بۆ دەکرد و، داوایان لەخوا دەکرد لەخۆی و دایك و بابی خۆشبێت و، ئەو بازرگانییە پیرۆزەی لێ موبارەك بێت. سەرباری ئەوەش ، دەمدی زۆر یادی خوا دەکات و، سەڵاوەت لەسەر پێغەمبەر ( **صلی الله علیه وسلم**) دەدات،لێم پرسی:نێوانی خۆمان بێت، ڕۆژی چەند سەڵاوەت لەسەر پێغەمبەر **صلی الله علیه وسلم**)لێ دەدەی؟ گوتی:مادام لێم دەپرسی، با وەڵامت بدەمەوە: ڕۆژی هەزار سەڵاوەت لەسەر پێغەمبەر ( **صلی الله علیه وسلم**) لێ دەدەم؛ لەپێش هەر نوێژێك سەد جار و، لەپاش هەر نوێژێکیش سەد جار. ئەو پیاوە بازرگانێکی گەورەش بوو، خوا نیعمەتی خۆی پێ بەخشیبوو، ئەویش هەوڵ وکاتی خۆی لەو سوودە مەزنەدا خستبۆکار، خواش ئارام و دڵنیایی پێ بەخشیبوو و، خوا یاربێ گەورەترین پاداشتیشی دەداتەوە.  بەپێچەوانەشەوە، چەندان بازرگانی دیکە دەناسم، هێندەی بەدوای درهەم ودینارردا بگەڕێن، هەلا هەلا بوون و، بوونەتە بەندەی دنیا؛ نوێژ بەڕێکو پێکیی ناکەن و دەیچوێنن و دوای دەخەن و، سوو(ڕیبا)دەخۆن و، گوێ نادەنە مافەکانی خوا لەسامانندا و، نە کەفالەتی هەتیوێك دەکەن، نە مزگەوتێك دروست دەکەن، نە یارمەتیی هەژارێك دەدەن، تەنانەت هەندێکیان زەکاتیش لە سامانیان دەرناکەن! جا بزانە ئەو دووانە چەند لێك جیاوازن! لەبەر ئەوە مەهێڵە سامان بەسەرتدا زاڵ بێت و،ئەو بکە خزمەتکاری خۆت، تۆ مەبە خزمەتکاری، لەدڵتی دەربێنە و لەگیرفانتی باوێ؛ چونکە سامان خزمەتکارێکی چاکە، بەڵام گەورەیەکی خراپە!

## نازانی لەکوێڕا دەرووت لێ دەکرێتەوە

شێخ موحەممەدی کوڕی زافیری قەرەنی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - کە بانگخوازێکە لە((غامید))خوێندوویەتی و، پاشان بەماڵەوە هاتۆتە پارێزگای(بەلجەرشی)،بۆی گێڕامەوە، گوتی: خۆراکم لێ بڕا و هیچ برادەریشم نەبوون قەرزیان لێ بکەم، ئیدی خەمێکی گران دایگرتم. لەدڵی خۆمدا گوتم: بڕۆ نێو بازاڕ، ئەوە خوایە بەڵکو هۆکارێك، ڕۆزییەك،پیاوێکی ناسیاو بنێرێت، یان برادەرێك لەگوندەکانی خۆمانڕا، یان شتێکی لەو بابەتە پەیدا بێت. گوتی: چوومە بازاڕ، لەوێ ڕاوەستابووم، پیاوێك پەیدابوو، نە دەمناسی، نە دەیناسیم، هەندێك پارەی دە دەستی نام و گوتی: ئەمە بگرە! تەماشامکرد بڕە پارەیەکی چاکە خوا بۆی ناردووم، ئیدی هەرچی پێداویستی ماڵێ بوو، لەخۆراك و پۆشاك، کرِیم وخوای گەورە دەرووی لێ کردمەوە. ئەو بانگخوازە چەندان سیفەتی دۆستانی خوای تێدا بوو، وەکو: ساغیی دڵ و دەروون و زۆر یادکردنی خوای گەورە و، حەزکردن لەخێر و چاکە و بێفیزیی و، هەموو تەمەنی لەخواپەرستیی و قورئان خوێنیی و بانگەوازدا بردە سەر. ئەوە بەڵگەیە، کە دەروو لێ کرانەوە لەلایەن خواوە نزیکە. کەواتە: نائومێد و عاجز مەبە، ئەگەر ڕوژێك ڕۆزیت دوا کەوت، ئەوە بە ئیزنی خوای تاك و تەنیا، بۆت دێت، جا پێویستە پشت بە خوا ببەستی و، کاروباری خۆتی پێ بسپێری.

## نوێژ کلیلی بەختەوەیی و دڵنیاییە

بابم، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، بەگوفتار و ڕەفتاری چەند هانی دەداین بۆ نوێژکردن! منداڵ بووم، تەمەنم هەر حەوت ساڵ دەبوو، بەسارد و سەرمای کێوەکانی باشوور،تەنانەت بۆ نوێژی بەیانیش دەگەڵ خۆی دەیبردمە مزگەوتێ، هەر بۆم نەبوو بیر لەدوا کەوتن بکەمەوە، دوا کەوتبام، سزادان و تەمبێکردن چاوەڕوانم بوو، لەبەر ئەوە لەلای من پارێزگاریی لە نوێژ، گرنگترین و پێویسترین شت بوو، تا وای لێ هات بەهۆی ڕەفتارو پەروەردەی بابمەوە،لێم بوو بوو بە نیمچە ئالوودە بوون(**إدمان**)ێك! ئێستاش قەت دواخستنی نوێژم هەر بەبیردا نایەت و، هەتا نوێژ و پارێزگاری کردن لە نوێژم وەبیر دێتەوە، ڕەحمەت بۆ بابم دەنێرم. نوێژ سەرچاوەی هێزو توانایە، تەنانەت لە قورئاندا لەگەڵ ڕۆزیی لێك گرێ دراون: ((**وَأمُرْ أَهْلَكَ بِالصَلاَةِ وَا صْطَبِرْ عَلَيْهَا لاَ نَسْأَلُكَ رِزْقَاً نَحْنُ نَرْزُقُكَ والعاقِبَةُ لِلتَّقْوى** – فەرمان بە کەس و کاریشت بکە نوێژ بکەن و بۆ خۆشت سەبری لەسەر بگرە، ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین، بۆ خۆمان ڕۆزیت دەدەینێ و سەرەنجامیش بۆ پارێزکردنە لەخوا )) **طه** (١٣٢). نوێژ یەکسەر لەدوای یەکتا پەرستیی دێت. زۆر کەسی دیکەش لە پیاوانی بەتەمەن، وەکو بابم بوون، بەردەوام لە ڕیزی یەکەمی نوێژ لەپشت پێشنوێژ بوون، ڕقە (**منافسه**) یان لەگەڵ یەکدی دەکرد، کێهەیان زووتر دێتە مزگەوتێ، دەمدیت لە پارێزگاریی

کردن لەنوێژ بابم زۆر سەیر بوو؛ زۆر جار نیو سەعاتی دەما بۆ نوێژێ، دەچۆ مزگەوتێ تا نوێژ دەبوو، حەجمینی نەبوو تا بانگی دەدا- ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لەزۆر گەڕەكان ژیاوم، هەندێك خەڵكم دەدیت لەپارێزگاری كردن لەنوێژ، سەرمەشقن؛ تەنانەت زۆریان لەنوێژی شێوانڕا تا نوێژی خەوتنان دەمانەوە، هەشیانبوو لەدوای نوێژی بەیانییەوە تا ڕۆژهەڵدەهات لەمزگەوت دەمایەوە، پاشان نوێژی سوننەتی دەكرد و دەچۆ دەرێ. ئەو كەسەی نوێژ بەڕێكو پێكیی ناكات، یان بەسستیی دەیكات، یان هەر نایكات،چۆن هەست بەبەختەوەریی دەكات؟! لەكوێڕا ڕووناكیی بۆ دێت؟ لەكوێڕا ڕەزامەندیی پێ دەگات؟ لەكوێ ئارام و دڵنیایی دەدۆزێتەوە؟ جا وەسیەتم بۆ تۆ ئەوەیە كە لەدوای یەكتاپەرستیی ، نوێژ كردن لەكاتی خۆیدا بەگرنگترین شت بزانی و، ئارام گرتن لەسەری و دەست پێوە گرتنی و، هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی لەكاتی خۆیدا بەكۆمەڵ و ملكەچیی، بە لەپێشترین واجب لەقەڵەم بدەی. جا ئەگەر واتكرد، مزگێنیت دەدەمێ كە تۆ پارێزراوی و، ڕاستەڕێ و ڕۆزی دراوی و، سەركەوتوو و پشتیوانیی كراوی و، بێجگە لە مەترسیی گوناحانت، لە هەموو مەترسییەك وەدوورخراوی. ئەوەیە نوێژ لەگەشترین شێوەی و جوانترین ڕوخساریدا، ((رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصلاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي - پەروەردگاری خۆم ، خۆم و ڕەچەڵەكم بكە بەرپاكەری نوێژ))**ابراهيم** (٤٠)

## قسە خۆشێكی هاوسەنگ بە، خەیاڵت ئاسوودە دەبێ!

بۆ خۆم قسەی خۆشیی مامناوەندیی و، گاڵتەی ڕێ پێدراوم تاقیكردۆتەوە، ئەو جۆرە گاڵتە، دڵی خەڵك ڕادەكێشێ و ، ئاسوودەیان دەكات و،ئارامیی و شادیی و كرانەوە بەدەروونیان دەبەخشێت؛ جا لەژیانتدا قەت وشك وبرینگ وگرژ و مۆن مەبە و، نە دەگەڵ خۆت، نە دەگەڵ خەڵكی دەوروبەرت دڵڕەق مەبە؛چونكە پێغەمبەر( **صلى الله عليه وسلم)** زۆر لەگەڵ برادەرەكانی پێدەكەنی و بەڵكوگاڵتەشی لەگەڵ دەكردن و، هەندێك جار تا خرێیەكانی دەر دەكەوتن، پێدەكەنی. ئەمنیش زۆر جار بەچەند ڕوونكردنەوەیەك دڵی مامۆستا و هاوڕێكانم خۆشكردوە و، ئەوانیش زۆریان پێ خۆش بووە و حەزیان لێ كردوە. شێخ ((عوبەیدوڵڵای ئەفغانی))ی مامۆستام، كە لەئامادەیی و زانكۆ دەرسی قورئانی پێ دەگوتین، پیاوێكی زۆر سەنگین و كەمدوێ بوو، هەندێك جار ئەوەندە پێدەكەنی، هەموو لەشی دەلەرزی! جارێك لەحەجێ لەگەڵی بووم؛ دوو كەسی ناوچەی باشووریشی دەگەڵ بوون؛ یەكێكیان مامۆستایەكی وەك خۆی بەتەمەن وئەوی دیكە گەنجێكی لەتەمەنی مندا بوو. كە لەحەجێ بووینەوە، لەشەوەكانی میندا، شەوێك نوستین، كاتێك بەتەواویی خەومان لێكەوت، لەگەڵ دەنگی شایەتمانی شێخ وەخەبەر هاتین كە زەختی دابەزیبوو، هەستاین تەماشا دەكەین ئارەقی لێ دەچۆڕێت، گوتی : كاغەزێكم بۆ بێنە؛ وایزانی دەمرێت ... وەسیەتەكەی بۆ نووسیم و شەهادەی هێناو قەرزەكانی نووسین. ((شێخ ئەلەعی)) – كە لەگەڵمان بوو – هەستا هەندێك هەنگوینی هێنا، كەپێی بوو، لەكووپێكی كرد تا نیوە بوو،پاشان لەگەڵ ئاوی زەمزمی تێكەڵ كرد و دای بەشێخ و خواردیەوە، هەستی بە ئاسوودەیی و ئارامیی و دڵنیایی كرد، بەدیارییەوە دانیشتین، تا خەوی لێكەوت. شەوی دووەم ئەمنیش هەمان كاری شێخم كرد، هەڵبەت ساغ و سەلیم بووم؛ بەڵام دەمویست هەڵێكم بۆ هەڵكەوێت

زەفەر بەهەنگوینەکە بەرم، بە برادەرە گەنجەکەمم گوت: هەر کە وەسیەتەکەم نووسی و شایەتمانم هێنا، دەمو دەست برۆ نیو کووپم هەنگوین بۆ بێنە و،لەگەڵ ئاوێی تێکەڵکە، هەر کە ئەوان نوستن، هەستام شەهادەم هێنا و خۆم هێنایە حاڵی جاوی، یەکسەر برادەرەکەم هەستا کاغەزێکی بۆ هێنام، ئەمنیش وەسیەتەکەم بۆ نووسی، شێخ ئەفغانیی و شێخ ئەلەعیی، تەماشایان دەکردم، زۆریان پێ سەیر بوو! پاشان — وەکو ڕێککەوتبووین — برادەرەکەم غاریدا هەنگوینەکە و، نیو کوووپی تێکرد و لەگەڵ ئاوی زمزم تێکەڵی کرد و خواردمەوە، کە لێ بوومەوە، ڕووم دە شێخ ئەفغانیی کرد و پێم گوت: پێت وایە هەر ئەتۆ دەزانی فێڵێ لە خەڵکی بکەی و هەنگوینی بخۆیەوە؟! ئیدی شێخ ئەوەندە پێکەنی، لەبەر پێکەنین ڕووی خۆی داپۆشی و، بەو جۆرە ئەو شەوە بەخۆشیی و شادیی نوستین.

کەواتە: با ژیانت هەندێك قسەی خۆش و سووکە گاڵتەی تێدا بێت و، دەگەڵ خەڵکی ڕووخۆش بە و، لە ڕووحسووکیی و جوان هەڵبژاردن و پاکبینیدا، وەکو هەنگ بە.

## لەماڵی خۆت وەك چۆلەکە بە

خێزانەکەت لەهەموو کەس لەتۆ نزیکترە و، لەهەمووان زیاتر پێویستیی بەچاکە و سۆزی تۆیە، جا کە چوویەوە ماڵێ، کێشە و گرفتەکان لەدەرەوە دانێ، هەروا باسی ڕوودا و وقەیرانەکانیش، بە پێکەنین و بزەوە برۆ ژووری، گاڵتە لەگەڵ خێزان ومنداڵەکانت بکە و، لەحاڵ وباڵیان بپرسە و، چیرۆکانیان بۆ بگێڕەوە و، قسەی خۆشیان بۆ بکە و، هاودەمیان بە و، دەگەڵیان ڕووخۆش بە و، سەر قاڵی پێوەندییەکانت و ئەو خەم و خەفەت و گرفتانەی تووشت هاتوون، مەبە؛ چونکە ئەو کاتەی بۆ خێزانەکەت تەرخان کردوە، هەر دەبێ کاتی خۆشیی و شادیی و گاڵتە و قسەی خۆش و لێك نزیکبوونەوە بێت؛ چونکە وەك تامەزرۆیی زەویی وشك و بێ ئاو بۆ ڕێژنە باران، تامەزرۆی هاتنەوەی تۆن. کەواتە:ئەو کەش و هەوایەی خۆشەویستیی و هۆگریی و شادییەی باڵی بەسەر ئەو دانیشتنەدا کێشاوە، تێك مەدە و، کێشەو ناکۆکیی دەگەڵ هاوسەرەکەت دروست مەکە و، لەگەڵ منداڵەکانت شێوازی مشتو مڕ و تەمبێ کردن بەکارمەهێنە. لێپرسینەوە بۆ کاتێکی گونجاو و دانیشتنێکی گونجاو هەڵبگرە، بەڵام یەکەم جار کە دەچییەوە ماڵێ، دەبێ دانیشتنەکە دانیشتنی سڵاو و چاك و چۆنیی و قسەی خۆش و، یادی نیعمەتەکانی خوا بێت . چۆن جووجکە باڵندە، کە دایکیان دێتەوە و، سۆزو گەرمیی و خواردنیان دەداتێ، لەهێلانەکەیاندا دەگە شێنەوە، دەبێ باوکیش کە دەچێتەوە ماڵێ، منداڵەکانی ئاوا شاگەشکە بن و دڵیان بپشکوێت. هەمیشە ئاوا بە؛ کە دەچییەوە ماڵێ، چوێلەکەیەکی ڕووحسووك و خوێن شیرن بە کە بەئارامیی دەفڕێت، ئەو کاتە دەکەویە نێو شادیی و ئاسوودەیی و ئارامیی. ئەمن یەکە باری خۆم، لەنێو چاوی گەردەلوول و لەسەختترین ڕەوشدا، قسەی خۆش و گاڵتەی خۆم هەر کردوە! ئەو کاتەی لەفلیپین تەقەیان لێ کردم و بریندار کرام، لەخەستەخانە لە سەر جێ

کەوتبووم، ڕۆژنامە نووسێك هات لێی پرسیم : لەدوای کتێبی ((**لا تحزن** – خەمبار مەبە))، بەتەمای چ کتێبێك بنووسی؟ گوتم: ((**لا تُسَافِرْ** – سەفەر مەکە!)). یەکێکی دیش لێی پرسیم: ئەو لایەنە گەشانە چین کە لەڕووداوەکەی فلیپین وەدەستت کەوتوون؟ گوتم: ئێستا بەدەستی چەپ دەخۆم؛ چونکە ڕاستەم پەکی کەوتوە، لەسەر پشتم نوێژ دەکەم، خوێنێکی زۆری برایانی فلیپینیشم تێکراوە. یەکی دیکە گوتی: ناخۆشترین شتی ڕووداوی تەقە لێکردنەکەت چ بوو؟ گوتم: فانیلە تازەکەمیان لەبەر چاوی خۆم هەڵدڕی، هەڵبەت زیانی ماڵ و سامانیش وەك زیانی گیانی نییە! ئەمانە و زۆر هەڵوەستەی دیکەش کە سێبەری هۆگریی و شادیی و خۆشیی بەسەر هەمواندا دەکشاند.

## ئیشی خۆت جێبەجێ بکە، خەیاڵت ئاسوودە دەکەی

لەژیانی خۆمدا تاقیم کردۆتەوە، هەر ڕۆژێك زوو هەستابم و، زکر و ویرد و ئیشەکانم تەواوکردبن، هەر وەکو پێغەمبەر( **صلى الله عليه وسلم**) دەفەرموێ: ((**أَللَّهُمَّ بارِكْ لأُمَّتِي في بكُورِها** – خوایە گیان خێرو بەرەکەت بخە سەرلەبەیانیانی نەتەوەکەم)) **رواه أبوداود والترمذي**... هەموو ڕۆژەکەم ڕێکوپێك بووە و، هەستم بەدڵکرانەوە و ئاسوودەیی کردوە، بەڵام ئەگەر کارەکانم دوا خستبن و، بەسەر یەکدا کەڵەکە بووبن، تووشی نیگەرانیی و شپرزەیی و دڵتەنگی و بێزایی بووم. جا ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە: ئەو ئیشانەی بەتەمای بیانکەی لە لیستێکدا بیاننووسە، لەهەرە گرنگەکانرا پێدا وەرە و، هیچ ئیشێك بۆ کاتێکی دیکە دوا مەخە؛ چونکە هەر کاتێك تایبەتە بەئیشی خۆی، نەك ئیشێکی دیکە. بە خۆشەویستەکانیشم دەگوت: بەڕاستی هەر کەسێك نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات و،پاشان بەشە قورئانی ڕۆژانەی خۆت بخوێنێت، ئەوە هەر لەسەرەتای ئەو ڕۆژەوە دەرگای سەرکەوتن و سەرفرازیی لێ کراوەتەوە. بەڵام ئەو کەسەی تەنبەڵیی بکات و خۆی بگنخێنێت و، نوێژی بەیانیی بچێت و زکرەکان نەکات و بەشە قورئانەکەی نەخوێنێت، لەسەرانسەری ڕۆژەکەدا نیگەران وپەست و خەمبار دەبێت و ناگاتە ئەو ئەنجامانەی بەتەمایانە. کەواتە: هەموو ڕۆژێك لیستەیەك بۆ مەوعیدەکانت دانێ و ئەنجامیان دە و، هەوڵیشدە پوخت و ڕێك ئەنجامیان بدەی. بەو جۆرە ژیانت پڕ دەبێ لەجموجووڵ و چالاکیی و، بە ئارامیی بەڕێوە دەچێت و- پشت بەخوا – دەگەیە پلەکانی سەرکەوتن و ئاسوودەیی .

## هەموو ڕۆژەکەت مەکە پشوودان نەبادا هەمووی ببێتە ماندووەتیی

ناکرێ ئەم ژیانە هاوسەنگیی تێدا نەبێت، جا ئەوەی سەرکەوتنی بوێت، دەبێ کاتی دابەش بکات؛ کاتێك بۆ ئیش، کاتێك بۆ خوا پەرستیی، کاتێك بۆ خێزان و کەسو کار، کاتێك بۆ برادەران. بەڵام – بەداخەوە – چەندان گەنجم دیتوون ڕۆژەکەیان هەمووی دەکەنە پشوو و، دەچنە لای برادەرەکانیان – بەتایبەتیی لەڕۆژانی مۆڵەتدا –

لەپشووخانە و باغ و دەرودەشت ، هەموو ڕۆژەکەیان تا نیوە شەو، یان تا بەرە بەیان بە پێکەنین گاڵتە و گەپ بەسەر دەبەن، پاشان دەگەڕێنەوە و وەك مردوو لەنێو جێدا تخێڵ دەبن و، دوایی زۆر بەدرەنگەوە، سست و پەست و دڵتەنگ هەڵدەستن! چونکە وا دەزانن ئەوەندە پشوو و حەسانەوەی بەهۆی زێدەڕۆیی وەریانگرتوە، ڕێگای دڵکرانەوەو شادییە، نازانن ئەوە بۆ خۆی خەفەت و بێزارییە؛ چونکە بەشێوەیەکی هاوسەنگ نە ژیاون. پشوو کاتی تایبەتیی خۆی هەیە و، پشوودان لەدوای ئیش و ماندوو بوون کارێکی ڕەوایە، بەڵام تۆ بچی سەرپاکی ڕۆژ یان تێکڕای شەو بکەیە گاڵتە و گەپ، ئەوە دەبێتە مایەی خەمباریی ڕووح و دڵتەنگیی. جا ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە: هەر شتێك ئەندازەیەکی بۆ دانێ؛ کاتێك بۆ خوێندنەوە، کاتێك بۆ خێزان، ئەوانە هەمووی دوای ئەوەی بەتەواویی مافی پەرستنی خوای گەورە دەدەی.

## پاك بەو پشت بەخوا ببەستە، ئارامگرو کار کوشتە بە، سەردەکەوی

لاوێکی یەمەنیی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: دەگەڵ برا گەورەکەم تێکگیرام و زۆر بەپیسی لێی دام، لەکن بابم شکایەتم لێ کرد، براکەم بەزمانلووسیی؛ هەڵەکەی بەسەر مندا هێنا؛ بابیشم دەستی بەلێدانم کرد و، فەرمانی بە براکانیشم کرد زۆر خراپ لێمدەن؛ هەستم بەتاڵاوی زۆر و ستەم کرد و لەماڵێ هەڵاتم، هەندێك پارەم پێ بوو، تووشی خاوەن ترومبێلێك بووم، پارەکەم دایەو گەیاندمیە شاری مەککە، ئەوە چل ساڵ لەمەوپێش بوو،لەوێ بەدوای کاردا دەگەڕام، دووکانێکم دی فەڕشی بەحاجیان و بەو کەسانەی دەهاتنە مەککە دەفرۆشت، داوای ئیشم لێکرد، ڕازیی بوو و، ئیدی لەوێ دەستم بەفەڕش فرۆشتن کرد. لەو ماوەدا بازرگانێکی تورکم ناسی، ڕەفتارو دەستپاکیی منی بەدڵ بوو، پەیوەندیی پێوە دەکردم و، ئەمنیش ئیشم بۆ دەکرد و چی ویستبا، بۆم پەیدا دەکرد و، فەڕشیشم بۆ دەفرۆشت ئەگەر هێنابای، ڕۆژێك پێی گوتم: دەڵێی چی لەتورکیا سەردانم بکەی؟ ڕازیی بووم و، دەگەڵی چوومە شارە جوانەکەی لەباکووری تورکیا، لەوێ بردمیە نێو کێڵگەکانی سەوزەوات و باغەکانی مزرەمەنی، سوپاس بۆ خوا پێی کار کوشتە و دەستپاك بووم و زۆری بەدڵ بووم، پێی گوتم: لەکێڵگە و باغەکە دەبیە شەریکم؟ گوتم: هەر زۆرم پێ خۆشە... ئەویش بەشێکی زۆری لێ دامێ و بوومە شەریکی، پاشان خانووێکم لەوێ دروستکرد.پاشان پێی گوتم: حەز دەکەی دەگەڵ کچەکەم هاوسەر گیریی بکەی؟ گوتم: پڕ بەدڵ پێم خۆشە، بوومە زاوای، ئەویش بازرگانێکی گەورە بوو، هەر ئەو کچەشی هەبوو و زۆریشی خۆش دەویست... ئەمنیش بوومە کوڕ و زاوا و خۆشەویسترین کەسی، پاشان لەدوای تەمەنێکی درێژ کۆچی دوایی کرد و، هەموو سامانەکەی بۆ کچەکەی بەجێما و، سوپاس بۆ خوا سەرەنجام بوومە یەکێك لەهەرە دەوڵەمەندەکانی تورکیا. هەموو کێڵگەکان و خانووەکان و سامانەکەی، بوونە ئی من و کچەکەی، سوپاس بۆ ئەو خوایەی دەرووی لێ کردمەوە. جا لەهیچ شتێك نائومێد مەبە؛ چونکە ڕەنگە لەدوای تەنگانە، خۆشیی بێت و هەندێك جار شتی زیانبەخش، سەرەنجامەکەی وەخێر دەگەڕێ، ((**فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً** – جا ڕەنگە ئێوە شتێکتان پێ ناخۆش بێت و خوا خێروچاکەیەکی زۆری پێوە بە

ستبێت )) **النساء**( ١٩ ) ، گرنگ ئەوەیە:بەدوای ئیشدا بگەڕێ ی و، دەستپاك بە و، كار بكە و، خۆت لەبوارە جیا جیاكان تاقی بكەوە، ڕەنگە لەبوارێكدا شكست بێنی، بەڵام لەبوارێكی دیكەدا سەركەوی، بۆ خۆت ئەو بوارەی لەگەڵ پسپۆڕیی و بەهرەی تۆدا دەگونجێت، بدۆزەوە.

## لەچۆڵەوانییەوە بۆ كۆشك و لەسەنگەرەوە بۆ وتێل

لە ئیتالیا تووشی بازرگانێكی گەورەی ئەریتیریی بووم، لە وتێلەكەی دابەزین، چەندان شەریكەی بازرگانیی و زەوی و زارو وتێلی دیكەشی هەبوون، كوڕەكەی ئەو وتێلەی بەڕێوە دەبرد. ئەو بازرگانە تەمەنی لەنەوەت ساڵ تێپەڕیبوو، بەسەر هاتی خۆی، ئەو كاتەی لەئەریتیریا بووە، بۆ گێڕامەوە... فەقیر بووە، لە كۆختەیەكی بەزەل و پووش دروستكراودا ژیاوە و، لە سەرەتای لاویدا لەچەند شەڕێكی ڕزگاریخوازی ئەریتیریادا بەشداریی كردوە و، بەبێ خواردن ماوەیەكی زۆر لەسەنگەرێكدا ماوەتەوە، پاشان كاروباری گۆڕاوە و ڕۆیشتە ئەوروپاو، لەشاری (میلانۆ)جێگیر بووە، فێری زمانی ئیتالیی بووە، پاشان چۆتە كۆمپانیایەك، دوایی لەو كۆمپانیایەدا بووە بە هاوبەش و دەستی خۆی دیتوە و هەندێك زەویی و زاری كڕیوە، تا وای لێهاتوە بووە بە بازرگانێكی گەورە. سەیر ئەوە بوو، دەگەڵ بازرگانییەكەشی، سومعەو ناوبانگێكی چاكی هەبوو و، زۆر بەرچاو و ڕێك و خاوەن ئاكار و ڕۆشنبیریی بوو. دەیگوت: لەگەنجیدا لەلای مامۆستایەكی حەزرەمووتی كە هاتۆتە ئەریتیریا، هەندێك زانستی خوێندوە و، دوعایەكی درێژی لێ فێر بووە، كە بریتیە لەخوێندنەوەی سووڕەتی (الاخلاص)ڕۆژی هەزار جار! دەیگوت: تا ئێستاش ئەو دوعایە هەر دەخوێنم و، بەچل، چل و پێنج خولەك، تا سەعاتێك تەواوی دەكەم. لەو سەركەوتنە گەورەی ئەو پیاوە لەسەر پێی خۆ ڕاوەستاوە سەرم سوڕ مابوو، كە دانی بەتێكشكاندا نە هێنا و، نەچۆ نێو جوغزی تەنبەڵیی، بەڵكو شێلگیرانە كاری كرد، تا بەئامانج گەیشت! سڵاوی خوا لەهیمەتگەلی بەرزو ئاواتی بێوێنە و دەستكەوتی گەورە، با ڕوو بكەینە بازاڕی گەورەی ژیان، كە جێی هەموومانی تێدا دەبێتەوە؛ چونكە ڕۆزیمان لەئاسمانە و هەر كاتێك ئامادەی وەرگرتنی بووین و، بۆ داواكردنی ، وە جووڵە كەوتین، لەوێرا بۆمان دادە بەزێتە سەر زەویی. كەواتە: وەرێكەون و چاوتان لەبەرەكەتی خوا بێ، بازاڕی كار چاوی لەرێیانە و، ڕزق و ڕۆزیتان لەبەردەمتانە.

## هەیە ئیشکردنی پێ عەیبە، بەڵام سواڵی پێ عەیب نییە

کاری شەرمەفمەندانەو پیشەی بەجێ،ئابڕوو دەپارێزێت و بەشێکە لەخواپەرستیی، وەکو خەیاتیی ، دارتاشیی، کڕین و فرۆشتن و هەر کاروپیشەیەکی دیکەی بەجێ. بەڵام زۆربەی لاوان ئەو ئیشانەیان پێ عەیبن و خۆیان پێ لەو کارانە بەرزترە و،پێیان وایە ئەوان لەوە گەورەترن ببنە نانەوا و پاقلەفرۆش و شت چن و خەیات و دارتاش و ئاسنگەر و پۆشاکفرۆش و فرۆشیاری مانگا و حوشتران، بەڵام ناوە ناوە دۆسیەکەی دەباتە کن دەوڵەمەندان، داوایان لێدەکات یارمەتیی بدەن یان بۆ ژنهێنان، یان بۆ دروستکردنی خانوو، یان قەرزدانەوە!هەرچەندە ئەو کەسە لاوێکی بەتواناشە و،ئەو جۆرە سواڵە لە دەوڵەمەندان دروستیش نییە، بەڵام پێی عەیب نییە، کەچی شتی حەڵاڵ و بەجێی پێ عەیبەو کاری حەرام و نا بەجێ دەکات! لەحەدیسدا هاتوە: ((**لإنْ يَحطب أحدكم حزمة على ظهره، خيرٌ له من أن يًسأل أحَداً، فَيُعْطِيه أو يَمْنَعُهُ** – ئەگەر هەر کامێکتان کۆڵە دارێك بەپشتی بێنێ و بیفرۆشێ، بۆی لەوە چاکترە داوا لەخەڵك بکات، داخوا بیدەنێ،یان نەیدەنێ!)) **رواه البخاري** ( ٢٦٥ ). چەندەها حەدیس هەیە داوا لەمرۆڤ دەکات لەکاری وا بپرینگێتەوە و، تەنها پشت بە خوا و پاشان بە هەوڵ و ماندووبوونی خۆی ببەستێت.

چ بەو گەنجە بڵێین خووی بەسستیی و تەنبەڵییەوە گرتوە و، وازی لەکار و کاسپیی حەڵاڵ و، گەڕان بەدوای ڕۆزیدا هێناوە، بەڵام پێی عەیب نییە لە دەرگای بازرگانان دەدات و، پشتگیریی و شایەتیی زانایان دەبات تا شتێکی دەستکەوێ، پێی بژیت، هەر چەندە لەو پەڕی گەنجیشدایە، ئایا ئەو کارە لەگەڵ زگماك و شەرع و عەقڵدا دێتەوە؟ هیوادارم لاوان بەم بابەتەدا بچنەوە و، بزانن کە لە پێغەمبەران هەبووە ئاسنگەر بووە، وەکو: داود؛ هەبووە دارتاش بووە؛وەکو : نووح؛ هەبووە بەکرێ شوانیی کردوە؛ وەکو: پێغەمبەری خۆمان ( **صلى الله عليه وسلم**).

ئەی گەنجینە، وەرنەوە سەرخۆ و، دامودەزگاکان و بوارەکانی ئیشکردن پڕکەن و، هیچ ئیشێکتان پێ عەیب نەبێت کە ژیانتان دابین دەکات و، لەخەڵکیتان بێنیاز دەکات.

# چاوان لەقووچ نێ و خوا بەپاك بزانە

بۆ خۆم تاقیم كردۆتەوە؛ هەتا دڵم تەنگ بووبێت و، خەم و خەفەتم زۆر بووبن، چاوم نووقاندوون و دەستم بە{**سبحان الله** – پاك و بێگەردیی بۆ خوا}كردوە، تا هەموو دنیا لەبیر بكەم و پەیوەندیی بەمیری میرانەوە بكەم، یەكسەر ئەو تەسبیحاتە بۆم بۆتە بنەمای قەناعەت و ئاسوودەیی و شادمانیی و دڵخۆشیی. خوای باڵا دەست دەفەرموێ : ((**فَاصبر علی ما یقولون وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل غروبها ومن أناء اللیل فسبح وأطراف النهار لعلك ترضی** – لەبەرانبەر ئەوەی – هەق نەویستان – دەیڵێن، ئارام بگرە و، پێش ڕۆژهەڵاتن ( لەنوێژی بەیانیدا) و پێش ڕۆژئاوابوون (لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسردا) و لەساتەكانی شەودا (لەنوێژی شێوان و خەوتنان) و لەسەرەتاو كۆتایی ڕۆژدا پەروەردگارت (لە هەموو هاوبەشێك) بە پاك بزانە، تا(لەپاداشتی دنیا و دوا ڕۆژی خۆت ڕازیی بی)) **طه** (١٣٠). هەروەها خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی( **صلی الله علیه وسلم**) كردوە كە لەكاتی تەنگانەو ناخۆشیدا، خوا بەپاك بگرێ: ((**ولقد نعلم أنك یضیق صدرك بما یقولون. فسبح بحمد ربك وكن من الساجدین** – ئەی پێغەمبەر، ئێمە سوور دەزانین كە بەو شتەی(دەربارەی تۆ و قورئان) دەیڵێن، دڵتەنگ دەبی. كەواتە: بەستایشكردنی پەروەردگارت، ئەو لە هەموو (هاوبەشێك) بەپاك بگرە و لە(نوێژكەران و) كڕنووشبەران بە)) **الحجر**( ٩٧،٩٨ ). زۆر جاران خەم و خەفەت دامدەگرێ و ناشزانم لەبەر چییە، ئەمنیش چاوان دەنووقێنم و، بەبیر كردنەوە و ئارامیی دەست بە گوتنی:(**سبحان الله وبحمده**، پاك وبێگەردیی و سوپاس و ستایش بۆ خوا دەكەم)، ئیدی تەمی خەمم دەڕەوێ و، دڵكرانەوە و خۆشیی و شادیی جێی دەگرێتەوە. هیوادارم تۆش ئەم ڕێگا سەركەوتووە تاقی بكەیەوە؛چونكە تۆ كە (**سبحان الله**)ت كرد،مانای وایە سكاڵای خەمی خۆت بردۆتە لای خوای پەنهانزان و كێشەكەت بۆ لای میری میران بەرزكردۆتەوە و، ئەویش لە هەموو كەس بەبەزەیترە و، تۆ داوای لێ بكەی و سوپاس و ستایشی بكەی و بەپێ داگرییەوە داوای دەروو كردنەوەی لێ بكەی، قەت بەتەنیا بەجێت ناهێڵێ. تاقی بكەوە: چاوان داخە و بە بیركردنەوە و تێڕامانەوە لەسەر(**سبحان الله**)بەردەوام بە، بەختەوەر دەبی. قورئان چەندەها جار لەدوای ناخۆشیی و تەنگانە، باسی (**سبحان الله** خوا بەپاك زانین)ی كردوە: ((**فاصبر علی ما یقولون وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب** – ئەی پێغەمبەر، لەبەرانبەر ئەوەی هاوبەش پەرستان دەیڵێن، ئارام بگرەو، پێش ڕۆژ هەڵاتن (كاتی نوێژی بەیانی)و پێش ڕۆژ ئاوا بوون(كاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر) بە ستایشی پەروەردگارت، ئەو (لەهاوبەش و هەر كەم و كورتییەك) بەپاك بگرە)) **ق** ( ٣٩ ). جا پێویستە هەموو حاڵ و باڵێكت بە زكری خوا و خوا بەپاك زانین چارەسەر بكەی؛ تەمی خەمت بە(**سبحان الله**) بڕەوێنە، شەوی نیگەرانیی و دڵتەنگیت بە (**سبحان الله**) بتارێنە، پشت بەخوا دەگەیە هەواری با سەفای بەختەوەریی .

# دایکم لەهۆیە هەرە گەورەکانی بەختەوەریمە

پیرۆزبایی لەو کەسەی ، دایکی ماوە دەکەم و، مزگێنیی بەختیاریی ئێستا و پاداشتی لەمەو دوای دەدەمێ، ئەمن ئەزموونێکی دەگمەنی بەختەوەریی و ژیانی ئاسوودەم لەگەڵ ژیان لەگەڵ دایکم هەیە، کە تەماشایم دەکرد وام دەزانی هەموو دنیا ئی منە و، کەدەچوومە لاشی، هەستم دەکرد تەنها خزمەتکارێکی بچووکم. هەموو باوەڕدارێك دەبێ ئەوە بزانێت، کە پێویستە کاتێك دەچێتە لای دایك و بابی، هەموو نازناوەکانی؛ وەکو نازناوەکانی: دوکتۆر، خاوەن شکۆ، جەناب ، مامۆستا، شێخ لەدەرەوەی ماڵێ دانێت؛ چونکە ئەو لەلای دایك و بابی، تەنها خزمەتکارێکی بچووکە؛ چونکە ئەوان - لەپاش خوا - هۆکاری بوونی ئەون و، ئەوانن - بەویستی خوا - بەسەری ڕادەگەن و ژیانی ڕادەپەڕێنن، بەڵام بەسەرهاتی من دەگەڵ دایکم، بەجۆرێکی دیکەیە... هەر کاتێك دایکم تەلەفۆنم بۆ بکات، هەموو کارو بارێکی ژیانم ڕادەگرم، ئەگەر چوومە خزمەتی ، لێی دەپاڕێمەوە ڕێم بدات لاقانی ماچ کەم، کاتێك بۆ دوعا و شوکرانە بژێریی دەستان بەرز دەکاتەوە،دەگەمە لووتکەی خۆشیی و ئاسوودەیی، دەمەوێ بە گاڵتەیەك، قسەیەکی خۆش بزەی بخەمە سەر لێوان، خۆشترین جەمی من ئەوەیە لەگەڵ ئەو بیخۆم و، پێ دادەگرم کە بەدەستی من بخوات، لەگەڵ ئەو دانیشتبم، وەڵامی هیچ تەلەفۆنێك نادەمەوە؛چونکە ئەو چاکترین و ڕاستگۆترین وبەوەفا ترین کەسە بۆ من.  ئەوە کە گەنجیەتیی خۆی لەپێناوی گەشەکردنی گەنجیەتیی مندا بەخت کردوە و، تین و تاقەتی بۆ بنیاتنانی تین و تاقەتی من داناوە و، ماندوو بووە، تا ئەمن بحەسێمەوە و، شەونخوونیی کێشاوە، تا ئەمن بنووم و، برسی بووە، تا ئەمن تێر بم. ئای دایکم بەچ چاکەیەك شەتەکی داوم! مەگەر بەدوعای ناخی دڵ، دەنا بەهیچ ناتوانم چاکەی بدەمەوە؛ چەند حەز دەکەم تۆزی سەر پێیەکانی بەفرمێسکانم بشۆم؛چونکە بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە! هەر کەسێك دایکی  مابێت، وەکو بەختیاریی و سەرکەتنی هەموو دنیای هەبێت، هەر شتێك دایك و باوکت دڵخۆش دەکات، بیکە و، ڕەزامەندییان وەدەست بێنە و ، ئەگەر ماون، دڵخۆش بە؛ چونکە دوو دەرگای کراوەی بەرەو ئاسمانن، جا بەئازاردان و دڵ ئێشاندنیان، هەوڵی داخستنی ئەو دەگایانە و تووڕەکردنی خوای باڵادەست و پاك  وبێگەرد مەدە . خوایە گیان، لەخۆم و دایك وبابم خۆشبە((**وَقُلْ رَّبِ ارْحَمْهُما كَمَا رَبَّياني صَغِيْراً** - بشڵێ: خوایە، ڕەحمیان پێبکە، وەکو چۆن ئەوان بەبچووکیی منیان پەروەردە کردوە)) **الإسراء** (٢٤) ..

# بەدوای شتی بەسووددا بگەڕێ

هۆشمەندان و پزیشکان و زانایانی دەروونزانیی، ئامۆژگاریی خەڵك دەكەن كە تەماشاكردنی تەلەفزیۆن كەم كەنەوە؛ چونكە زۆربەی ئەو شتانەی پێشانی دەدات، هەواڵی ناخۆشن ، وەكو: شەڕ و كوشتار و لەنێوبردن و دەربەدەر كردن و گرتن و زیندان و شتی لەو بابەتە. ئەگەر خوو بەتەماشاكردنی ئەو هەواڵانەوە بگری،ئەوە بی ئەوەی بەخۆت بزانی، تووشی شپرزەیی و نیگەرانیی دەبی و، ئەو كەسەش كە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكانی وەكو تویتەر، فەیسبووك، یوتووب، واتس ئەپ و ئەوانە بەكار بێنیێ، هەر وایە. هەر بابایەك خوو بەو شتانەوە بگرێت، تووشی نیگەرانیی و دڵتەنگیی و خەیاڵ بڵاویی دەبێت. خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەكی داناوە،كەواتە: هەوڵ بدە بەدوای شتی بەسوودا بگەڕێی و،لەهەواڵە ناخۆشەكان و دەنگۆ بەدخوازەكان وەدووركەوە؛ چونكە تۆ ناتوانی هیچ لەو ڕووداوانە بگۆڕی، جا شوێنی خۆت لە دنیا بزانە و، سەلامەتیی زەوق و، ئارامیی دەروون و، دڵخۆشیی خۆت بپارێزە، تا كارەكانی خۆت پێ ئەنجام بدرێن. هەر ئیشێك، كاتێكی تایبەتیی بۆ دانێ، قەیدێ ناكا سوود لەشتە چاكەكانی تەلەفزیۆن و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان وەربگری، بەڵام بەئەندازە و كاتی پێویست و وەك دەڵێن:(( هەموو شت بەخوێ ، خوێش بەمانا!)). چەندان ئیش هەن دەبێ بیانكەی؛ وەكو: نوێژلەكاتی خۆیدا، قورئان خوێندن، دانیشتن لەگەڵ خێزان، وەرزش و ئەو جۆرە بابەتانە. جا هەموو كاتەكان بۆ ئیشێك تەرخان مەكە،مافی ئیشەكانی دیكە بخۆی و لەئەنجامدا تووشی بێزاریی و شپرزەیی و نیگەرانیی بی. لەبنەڕەتدا مرۆڤی بەختەوەر دەبێ هێمن و ئارام و دڵنیا بێ و، وەك تەبایی و هاو ئاهەنگی ئاوی زوڵاڵ لەڕووباردا، لەگەڵ ئیش و كار و ئەركەكانی، هاو ئاهەنگ و تەبا بێ.

## خۆت لەشیعر خوێندنەوە تاقی بکەوە

(( ئیبنولجەوزیی)) لەکتێبی (( **مناقب أمير المؤمنين عمر بن الخطاب – رضي الله عنه** –کارە چاکەکانی سەرداری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێی خۆشبێت - )) دەڵێ: ئەگەر ئەو زاتە بەسەفەر چووبا، داوای دەکرد، کەسێك شیعری بۆ بخوێنێتەوە و، پێشتریش پێغەمبەری پێشەوا (**صلى الله عليه وسلم**)، (شەریدی سەقەفیی)، کەلەسەفەردا هاونۆرەی بوو لەسواربوونی ئێستردا، چەند دێڕە شیعرێکی بۆ خوێند بۆوە، هەموو جارێش لەدوای هەر دێڕێك پێی دەفەرموو: دەی، تا سەت دێڕی بۆ خوێندەوە. هەروەها خۆشەویست( **صلى الله عليه وسلم**)گوێی لەحوشتر لاواندنەوەی( سەلەی ئەکوەع) گرتوە و، ((حەسسان))یش چەند شیعرێکی بۆ خوێندوونەتەوە، کە هەندێکیان لەمزگەوتیش بوون. مەبەست ئەوەیە، لەکاتی بێ ئیشیی و لەتەنیاییدا، چەند دێڕە شیعریك بخوێنییەوە و زەمزەمەیان پێ بکەی ؛ چونکە زۆربەیان پەند و ئامۆژگاریی و دڵدانەوەیان تێدایە. ئەمن بۆخۆم لەسەفەردا تاقیم کردۆتەوە و، چەند دێڕە شیعرێکی هەڵبژاردەی خۆم خوێندوونەتەوە، تەواو دڵیان ئارام کردووم ، زۆر دێڕە شیعر چەندان پاڵەوانیان هێناونەتە مەیدانی شەڕ و ، هەندێکیان خەڵکی سەقیلیان کردوونەتە بەخشندە و سەخی و، ترسەنۆکیان کردوونەتە ئازا . لەو بوارەدا چەندان دێڕم لەبەرن ، بەڵام لێرەدا نامەوێ بابەتەکە درێژبێتەوە،مەبەستم ئەوەیە بەشێوەی جۆرا و جۆر سوود لە کاتت وەربگری و چالاکیت تازە بکەیەوە ،دوای قورئان خوێندن و ئەنجام دانی زکرو تەسبیحات ، بچییە سەر چەند بابەتکی شیعر و ئەدەب و چیرۆك ، تا سەرلەنوێ گوڕوتینی چالاکیت بێتەوە بەر ، ئەوەش ماوەی سانەوە و پشوودانە و پێی دەگوترێ ؛ ( پشووی جەنگاوەر) .

تاکو گەرم و گوڕو چالاك وشێلگیرانە بچیەوە نێو ژیان .

بەتاقی کەوە بزانە چۆن خۆشیی و ئارامیی وهۆگریت دەداتێ !

## چۆن لەبەر شێری هەڵدێی ، ئاوا لەبەر ساردکەرەوەی ڕەشبین هەڵێ

چۆن لەبەر شێری هەڵدێی ،ئاوا لەبەر ساردکەرەوەی ڕەشبین هەڵێ ، کابرایەکم دەناسی –خوا لەوی و لەمەش خۆشبێ – سەرچاوەی بێ زاریی ئێمە بوو، هەتا دەگەڵی دادەنیشتین ، هەواڵی دەنگۆی ترسناکی پێ دەداین و دەبۆ مایەی دڵتەنگیمان و بیری ئاڵۆزدەکردین و، لە فەرهەنگی ژیان هیچی نەدەزانی تەنها دەنگ وباسی هەژاریی و قەرز و شەڕ و هەرەسی ئابووریی و شەڕگەلی چاوەڕوانکراوی ناوچە و شکستی مسوڵمانان و گەلەکۆمەی دوژمنان و پیلانی دوژمنان لە دژی موسڵمانان .... تا کۆتایی ئەو لیستە ڕەشەی ، لە فەرهەنگی گەورە و هەراوی ژیاندا ، هەر

ئەو خاڵە ڕەشبینی ئامێزانەی تێدان . دانیشتن دەگەڵ وی ، هەر کۆڕی خەم و خەفەت بوو ، ئەگەر جارێك قسەیەکی خۆشمان کردبا ، دەیگوت : چۆن گاڵتەبکەین لەکاتێکدا قودس لەژێر دەستی دوژمنانماندایە ؟!

پێکەنیبایەن ،دەیگوت : چۆن پێبکەنین ، موسڵمانانی بۆرما و سۆماڵ لە عەزابێکی سەختدان ؟!

پێمان دەگوت ؛ باشە ، ئێمە وازمان لە پێکەنین هێنا ، ئەوان دەبنە کۆشك نشین و ماڵەکانیان ئاوەدان دەبنەوە ؟!

جاباباى وا هەیە هەمیشە داوای ڕەشبینیی و نائومێدیی دەکات ، هەڵبەت ئەوەش دژی ڕێبازی قورئانە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ((**الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ** – شەیتان ئێوە بە هەژاریی دەترسێنێ - تا زەکات نەدەن و خێر نەکەن - و فەرمانتان بە بەدکاریی پێ دەکات ، بەڵام خوا لەلایەن خۆیەوە بەڵێنی لێخۆشبوون و بەخششتان پێ دەدات و،خوا بەخشین فرەوانی زانایە )) **البقرة** – ٢٦٨.

کەواتە : دەگەڵ خەڵکی گەشبین و بە ئومێد و شاد و بەتەما هەستە و دانیشە و، هاونشینی خەڵکی تەنبەڵی سارد کەرەوەی ڕەشبین مەبە ، چونکە ئەوان دەردی خۆیان دەگەیەننە هاونشینەکەشیان و، هیچ سوودێکیان لێ هەڵناکرێنی ، لەبەر ئەوەی هیچ بەرهەم و دەسکەوتێکیان نییە ، ئەو ئازارانە دەرمان کات و، ئەو کێشەو گرفت و کارەساتانە لابات و ، تروسکەی هیوا و گەشبینیان تێدانییە ، بۆسەرلەنوێ دەست پێکردنەوەی ژیانمان ، چالاکیمان تازە کاتەوە ، جا چ پێویست ناکات کاتیان لەگەڵ بەفیڕۆ دەین و تەمەنی پیرۆزمان لە دانیشتن لەگەڵ بابای ساردکەرەوەی شکست خواردووی ڕەشبین بەسەر بەرین ؟!

## ئارەقی کرێکار لە میسکی بێکار باشترە

لە باشووری سعوودیە : گەلێك کرێکاری ئەفغانیی و پاکستانیم ناسیون ، بەهیمەت و چالاکیی خەریکی خانوو دروست کردن و، بیر لێدانن ،لە شاخەوە بەردان لە شوێنیکەوە بۆ بۆ شوێنێکی دیکە دەگوێزنەوە ، دیواران دروست دەکەن و بیران هەڵدەقەنن . هەریەکیان بگری ، لەشی دەڵێی کۆڵەکەی ئاسن ، یان کەرتە شاخە ، هەموویان لێو بە بزە ، یەك پارچە گەشبین و شادیی و خۆشین .... بەدرێژایی ڕۆژێ خەریکی ئیش و ماندووبوون و ئارەق ڕشتنن و، لەو پەڕی هێز و چالاکیی و توند و تۆڵیشدان ! ئەگەر کاتی نوستنیش هات ، بە ئاسوودەیی و خاتر جەمیی ، بەبێ نیگەرانیی و پەشێویی و خەم وخەفەت ، بەقووڵیی لێی دەنوون. هەندێك لاوی سست و تەنبەڵیش دەناسم ، بە پێچەوانەوە ، هیچ ئیشێك ناکەن و، لە ژوورەکانی نوستن و پشوودا، خۆیان بەرداوەتەوە ، تووشی نیگەرانیی و پەشێویی بوون و هەندێکیان دوای ماددەی هۆشبەر و هەلا هەلا بوون ،

لەخەم و خەفەفەت و پەشێویی و نیگەرانیدا ژیان بەسەر دەبەن ، جا تەماشای جیاوازیی نێوان ئەو دوو کۆمەڵە بکە ؛ کۆمەڵی یەکەم لەمانای ژیان حاڵی بوون : کە ژیان بیرو باوەڕ و تێکۆشانە و، شێلگیریی و لێبڕانی گەرەکە و، بازاڕ ئیش وماندووبوون و ڕقە ( منافەسە) یە و، کاسپیی شەڕافەتمەندانە خواپەرستییە و، ئارەقی کرێکار لەمیسکی بێکار باشترە ، جا ئەوانیش وەخۆکەوتوون و دەست بەکار بوون و، ڕۆزیی خۆیان و خێزانەکانیان پەیدا کردوە . بەڵام کۆمەڵی دووەم ، کە سست و تەنبەڵەکانن ، هەموو کاتی خۆیان بەقسە و قسەڵۆك بردۆتە سەر و، پاشان تووشی شتی حەرام و خراپی وەك جگەرە و ماددەی هۆشبەر هاتوون و، سەرەنجام تەمەن و تەندروستیی و ئارامیی و خۆشیی خۆیان دۆڕاندوە (( **فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ** – جا ئەی عەقڵمەندان – لەچارەنووسی ئەوان – پەند وەرگرن )) **الحشر**- ٢ .

## ئەوەی دەیەوێ سەرفرازییەك بنیات بنێت و ببێتە خاوەن ناوێکی چاك و پاداشتێك وەرگرێ

لە ڕیاز چوومە ماڵی یەك لە پیاو چاکان ، کە داکیان مەسرەفی پڕۆژەی ( ئەنجامدانی نۆ کتێبەکەی سوننەت )ی بە ئەنجامدانێکی جیهانیی کە بگاتە هەموو تاك و ماڵێك لەجیهاندا ، دەکێشا، تەماشام کرد خەریکی ئامادەکردنی کارێکی دامودەزگایی مەزنە ؛ دیمەنەکان و پێشاندانەکانیم دیتن، کە بەداگرتنی دوگمەیەکی مۆبایلەکەی بەردەستت، ڕێوشوێنی پێغەمبەرمانی **(صلی الله علیه وسلم)** لەمەودوا دەگەیاندە هەر شەش کیشوەرەکە !

ئەوەش بە چاکەی خوا، پاشان بە چاکەی ئەو ئافرەتە چاکە و کوڕە نەجیبەکانی ، کە سەرکەوتنێکی گەورەیان بەنسیب بووە و ، تەمەن و سەرفرازییەکانی خۆیان کردنە جەند قات ! لێرە شیعرەکەی (موتەنەببیی )م هاتوە بیر:

**ذكر الفتى عمره الثاني وحاجته        ما قاته وفضول العيش اشغال**

بۆیە شاعیر دەڵێ:

دەوران دەوڵەتت لە دەست دەر دێنێ – بەڵام ناوی چاك تا سەر دەمێنێ

لە کردنەوەی ئەو پڕۆژەدا، لە وتارەکەمدا گوتم: ئێوە سێ نوور و سێ بەڵێنی پێغەمبەرتان **(صلی الله علیه وسلم)** وە دەست کەوتوون ، چونکە لە حەدیسی دروست( صحیح )دا هاتوە: {**إذا مات إبنُ أدم إنقطع عمله إلاَّ من ثلاث : صدقة**

جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له– مرۆڤ ئەگەر مرد ، تەنها لە سێ لاوە نەبێت، کردەوەی نامێنێ؛ خێرێکی نەبڕاوە ، یان زانستێك خەڵك لێی بەهرەمەند بن ، یان منداڵێکی چاك دوعای بۆ بکات )) رواه مسلم (١٦٣١) .

هەڵبەت خێری نەبڕاوە ئەو وەقفەیە ئێوە بۆ خزمەتکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) کردووتانە ، منداڵی چاکیش - خوا یاربێ - ئێوەن بە دوعاکانتان بۆ دایك و بابتان ، ئەو زانستەش کە خەڵك لێی بەهرەمەند دەبن ، زانستی ڕێوشوێنی پیرۆزی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە لە سەرانسەری دنیا بڵاوتان کردۆتەوە .

بەپێچەوانەشەوە ، چەندان بازرگان و دەوڵەمەند دەناسین ، پاراو سامانی خۆیان لە شتی گوماناویی ، تەنانەت لە ڕابواردنی حەرامیشدا سەرف کردوە و، هەرچی ڕێی خێر و چاکە و سەر ڕاستییە ، پێی نازانن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ((فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ – پاشان دەیبەخشن و، ئەوجار لێیان دەبێتە حەسرەت و لەدوای ئەوە تێك دەشکێن )) الأنفال (٣٨)

جا هەر کەسێك بیەوێ سەرفرازییەك بنیات بنێت و ببێتە خاوەنی ناوێکی چاك و، پاداشتێکی لە زاتی هەرە بەبەزەییەوە دەست کەوێت ، با ماڵەکەی لە شتی بەسووددا سەرف کات ((يَوْمَ لاَ يَنْفَعُ مالٌ وَلاَ بَنُونَ،إِلاَّ مَنْ أَتَى اللهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ – ڕۆژێك نە ماڵ و سامان سوودی هەیە ، نە منداڵ. مەگەر کەسێك بە دڵێکی ساغەوە بگەڕێتەوە لای خوا)) الشعراء (٨٩) .

## ئەگەر ویستت تام و چێژ لە نیعمەت بکەی

چەندان جار لە گەلێك دەعوەت چوومەتە سەر سفرە و زۆربەی خەڵك نە ( بسم الله )ی کردوە ، نە ( الحمدلله )و ، بیر لەو نیعمەتەی دەیخۆن، ناکەنەوە و، سەرگەرمی قسە و باس و قاقای پێکەنینن و، لە سوپاسکردنی نیعمەتبەخشی پاك و باڵا بێ ئاگان ، هەر دڵیی بە بیریاندا نایەت ئەو خواردنەی دەیخۆن و ئەو ئاوەی دەیخۆنەوە و، هەموو ئەو نیعمەتانەی لەسەریان دەڕژێن ، لە چاکەی خوای باڵادەست و بەخشندەن !نە ( بسم الله )ی سەرەتاو، نە ( الحمدلله )ی کۆتایی و ، نە دان نان بە نیعمەتی نیعمەتبەخش ، وەك بڵێی ئەو نیعمەتانە بە چەند چەکێك لەباب و باپیرانیانەوە بۆیان ماونەوە ، یان بە زیرەکیی و لێهاتوویی خۆیان وەدەستیان هێناوە ، هەرچەندە هەموویان بەندە گەلی هەژارن ، برسی دەبن ، دەمرن ، شتیان لەبیر دەچێتەوە ، بێ ئاگا دەبن ....!

جا ئەگەر ویستت تام و چێژ لە نیعمەت بکەی و، سوودی لێ وەربگری ، ئەوە سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکە و ، بەناوی خوا دەستی پێ بکە و، کە تەواویش بووی، سوپاسی خوا بکە . شتێکی جوانە لە کاتی خواردن و

خواردنەوەدا بلێی : سوپاس بۆ خوا ، سوپاس بۆخوا، ئەو کاتە نرخ و بەها و چێژی ئەو نیعمەتە دەزانی . بەڵام ئەو کەسانەی وەکو ئاژەڵ ، بەبێ ئاگایی دەخۆن ، نە هەست بە شکۆی ئەو نیعمەتە دەکەن ، نە بە چاکەی نیعمەتبەخشی پاك و باڵا و ، نە سوپاس و شوکرانە بژێریی خوا دەکەن و ، نە پەیڕەویی لە ڕێوشوێنی پێغەمبەر (د.خ) دەکەن . با چێژ لە هەموو نیعمەتیك وەرگرین لکاتی خۆیدا ، وەکو خوای گەور دەفەرموێ: (( **كُلُوا مِنْ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً** – لە شتەچاك و بەکەڵکەکان بخۆن و کاری چاك بکەن )) **المؤمنون** ( ٥١ ).

ئەگەر پەرداخە ئاوێکت خواردەوە ،( بسم الله )ی بکەو، پاشان سوپاسی خوا بکە و، بیر لەو ئاوە بکەوە (( **أَفَرَءَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ،ءَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ** – جا ئایا ئەو ئاوەی دەیخۆنەوە، دیتووتانە ؟ ئایا ئێوە لە هەورەوە باراندووتانە یا ئێمە باراندوومانە ؟ )) **الواقعة**( ٦٨، ٦٩ ).لە قوڵایی ڕووح و ناخی دڵتەوە بڵێ: سوپاس بۆ خوا و، بیر لە نیعمەتی خوا ، لەدروست کردنی ئەو ئاوە و بەردەست کردنی ، بکەوە. دەربارەی هەموو نیعمەتەکانی دیکەش ، هەروابکە، ژیانێکی تازەو دنیایەکی دیکەی هۆگریی و خۆشیی و خوا پەرستیی دەدۆزییەوە .

## ڕۆژێکی جوانی ژیانم کە لە بیرم ناچێ

پیاوێکی عەشیرەتەکەم ( بالقرن ) لە باشوور دەعوەتی کردم ،لە قەراغی شاخ ، باغێکی خنجیلە و خانوێکی چکۆڵەی هەبوو ، زۆری بەخێرهێناین و هەتا بڵێی نزیکیی و گەورەیی نواند ، ئێمەی دانیشاند و بۆخۆی هەستا بۆ بەجێهێنانی ڕێوشوێنی میوانداریی . مێگەلە مەڕێکیشی بۆ شیر لەکن بوو ، لەگەڵ چەند خەڵێفە مێشێك کە بۆ هەنگوین دەیبڕینەوە .... پاشان بۆ خۆی ئاوری کردەوە و قاوە و چای لێنا ، دوای ئەوە بەرخێکی گرت و بەدەستی خۆی کوشتییەوە ، هەندێك گۆشتی لەسەر پۆلوان دانا و ، هەندێکیشی دە مەنجەڵێ هاویشت بیکوڵێنێ ، هەندێکیشی هەویر شێلاو لەسەر ئاورەکە کردیە نان . قەت ئەو زەردەخەنانە و ئەو ڕووخۆشییە و، تامی ئەو خواردنە و، هێمنیی ئەو ماڵە و، دڵفرەوانی خانە خوێکەمان لەبیرناچێ ، هەرچەندە دەستیشی کورت بوو ، بەڵام بەوەی خوا پێی دابوو، قایل بوو ، بە چاکترین شێوە چێژی لە ژیان وەردەگرت و، سەرەڕای سەرقاڵیی و ئیش و کار و کوێرەوەریی ، لەشێکی دامەزراو و بەهێزیی هەبوو ، بەدەستی خۆی ئیشەکانی خۆی دەکرد ، جارێك شینایی و

باغەکەی ئاو دەدا ، جارێك مەڕەکەی دەلەوەڕاند ، جارێك بەکار و باری پووڕەهەنگ و هەنگوینەکە ڕادەگەیشت و ، ئیدی بۆخۆی ئیش و کاری خۆی ڕادەپەڕاند و، بەو هۆیەوە قەناعەت و بەختەوەریی و ئارامیی وەدەست هێنا بوو .

ڕۆژان ڕۆیشتن و قەت تام و چێژی ئەو دەعوەت و بۆنەیە و ئەو کەش و هەوا خۆشەم لەبیر نەچوو ، کە پاشماوەی ڕۆژەکەشی پڕ لە بەختەوەریی کردین ، ئەوکاتەی کە تەماشای باغە بچووکەکەی و ڕووەکە جوانەکانی و مێگەلە مەڕەکەی ،کە بەسەری ڕا دەگەیشت و ، ماڵە سادەکەی وبیرە ئاوە شیرنەکەی ، کە ئاوێکی زوڵاڵی ساردی لێ دەداینێ بێ ئەوەی چووبێتە نێو بەفرخانە و قاپان ، دەکرد ، دەگەڵ نانی دەشتێ کە بە جوانی لەسەر پۆلووان دەیبرژاند ...

ئای لەو ڕۆژە پڕ لە بەختەوەریی و خۆشییەی ژیانم ! کەواتە با بەم جۆرە بێ : سادەیی و، ڕۆژ هەر دەمەی جۆرێك و، دابەشکردنی سەعاتەکان بەسەر ئەو شتانەدا ڕووح بەختەوەر دەکەن و، هەست و دڵ دەگەشێننەوە .

ئەمن بە دڵنیایی دەڵێم : بەڕاستیی ئەم پیاوە ، بە کێڵگە چکۆلەکەی و، مێگەلە مەڕەکەی و، بیر و هەنگوینەکەی، لە زۆربەی بازرگانە ملیاردێرەکانی کە چەندەها کۆشکیان هەن، بەختەوەرترە؛ چونکە ژیانیان هەر لەسەر یەك ڕەوتە و لە سروشت دوورن و ، ژیانیان هەمووی زۆر لە خۆکردنە و، ڕەنگە بەهۆی ئەو سستیی و تەنبەڵییەی دایگرتوون ، ژیانیان یەك پارچە نیگەرانیی و پەشێویی و خەم و خەفەت بێت . کەواتە : با ژیانت سادە و کاتت جۆرا و جۆر بێت و، ناوە ناوە گاڵتە و قسەی خۆش بکە و بڕۆ نێو سروشت و ، نیشانەکانی دەسەڵات و توانای خوا لە گەردووندا بخوێنەوە و ، لەو نیعمەتانەی خوا لەم دنیایە دا پێی بەخشیوی ، سوود وەربگرە و، لەسەر ئەو شتانەی پێی داوی ، سوپاسی خوای گەورە و باڵا دەست بکە ...

## چێژ لە خوا پەرستیی وەربگرە ، هەست بەتامەکەی دەکەی

بە برادەرەکەمم گوت: چۆن دەست نوێژ هەڵدەگری؟ گوتی: خەڵك چۆن دەست نوێژ هەڵدەگرێ ، منیش ئاوا دەست نوێژ هەڵدەگرم . پێم گوت: زۆربەی خەڵك بە پێکەنینەوە دەست نوێژ هەڵدەگرن و، لەکاتی دەست نوێژ، قسەو گاڵتە دەکەن و، ڕەنگە ئاگایان لە خۆیان و، لە نیەت و تام و چێژی دەست نوێژ نەبێ ، گوتی: چۆن تام لە دەست نوێژ بکەم ؟ گوتم : ئەگەر ئەو حەدیسەی لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە و ئەبوو هورەیرە گێڕاویەتەوە ، بخوێنینەوە : ((**إذا توضأ العبد المسلم أو المؤمن فغسل وجهه خرج من وجهه كل خطيئة نظر إليها بعينيه مع الماء أو مع أخر قطر الماء، فإذا غسل يديه خرج من يديه كل خطيئة كان بطشتها يداه مع الماء أو مع آخر قطر الماء، فإذا غسل رجليه خرجت كل خطيئة مشتها رجلاه مع الماء أو مع آخر قطرالماء، حتى نقياً من الذنوب** – ئەگەر بەندەی مسوڵمان ، یان بڕوادار، دەست نوێژی هەڵگرت و، دەم و چاوی شرد، هەر گوناحێك بە نەزەری چاوانی کردبێت، لەگەڵ ئاوەکە ، یان: دەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکە لێی هەڵدەوەرێ و، ئەگەر دەستیشی شوشتن ، هەر گوناحێك بەدەستانی کردبێت

لەگەڵ ئاوەكە، یان: دەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكە ؛لێی هەڵدەوەرێ ، ئەگەر لاقیشی شردن، هەر گوناحێك بە لاقانی كردبێت ، لەگەڵ ئاوەكە، یان: دەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكە هەڵدەوەرێ ، تا بەتەواویی لە گوناحان پاك دەبێتەوە )) **رواه مسلم** ( ٢٤٤ ) ..

پاشان پێم گوت : ئەگەر لەكۆتایی دەستنوێژدا بڵێین: ((**أشهدُ أن لاإله إلاّ الله وحده لاشريك له،وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، ألهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين** – شاهیدیی دەدەم كە جگە لە ( الله ) هیچ پەرستراوی ڕاستەقینە نییە ، تەنهایە و هاوبەشی نییە و، شاهیدیی دەدەم كە موحەممەد بەندە و ڕەوانەكراوی خوایە ، خوایە گیان، بمكە یەك لە تۆبەكارەكان و، بمكە یەك لە پاك بووەوان)) **رواه أبوداود ،والترمذي ،وإن ماجة، وأحمد** .. جا ئەگەر دەگەڵ نیعمەتی كاتی دەست نوێژدا ژیاین ، چۆن پاك دەبینەوە و، چۆن پەیڕەوی ڕێو شوێنی پێغەمبەرمان كردوە و، چۆن گوناحمان لێ هەڵدەوەرن و، چۆن لەخوا پاڕاوینەوە و، چۆن بە قورئان خوێندن دڵەكانی خۆمان وریا كردوونەتەوە و، هەستمان بە گەورەیی خاوەنی وشەكانی كە دەیان خوێنین ، كردوە و ، ڕستە ڕستە لە قورئان تێگەیشتووین و، ئایەت ئایەت لێی وردبووینەتەوە و،لەكاتی خوێندنیدا ، هۆشمان لە هەمووشتێكی دیكە دابڕیوە و، بیرمان چڕ كردۆتەوە ، كە خوێندنەوە چۆن دەبێ !

ئەگەر ئێمە هەستاین نوێژمان كرد، دژایەتی شەیتانمان كرد و بە پەنابردن بۆ خوا ، خۆمان لێ پاراست و ، بەدڵگەلی ملكە چ ڕوومان لە بەخشندەی میهرەبان كرد و، لەبەر ئەوەی بەتەنیا قسەی لەگەڵ دەكەین ، دنیا و هەر كەسێكی تێیدایە و، گەردوون و هەرچی لێیەتی ، لەبیرمان چۆوە و، بە نیەتێكی پاك و حەز و تامەزرۆیی و، ملكەچیی و دڵ وریایی و بیركردنەوە و تێڕامان ، ڕوومان لە میری میران كرد، دەگەینە چ ئاست و ڕەوشێك ؟

ئەوە بۆ خوا پەرستییەكانی دیكەش بكە بە پێوەر ؛بەڵام كێشە ئەوەیە ئێمە گەلێك جاران خواپەرستیەكانمان بێ نیەت و بێ ئاگا لە خۆ بوون و، بێ ملكەچیی و، بێ تام و چێژ ئەنجام دەدەین و، بەو هۆیەوە پووچ و بەتاڵ دەبن و تەنها هەندێك جووڵە و ڕاوەستان دەردەچن و هیچی دیكە . بریا خوا پەرستیمان بە ئاگا لەخۆبوون و ملكەچیی و خۆ ڕادەستكردنی خوای پەروەردگاری بوونەوەر، تاقی كردبایەوە ، بزانین چۆن بۆمان دەبۆ ڕووح و دڵئارامیی ودڵنیایی و ئاسوودەیی !

## وەك خۆت بژی و زۆر لە خۆت مەكە، باكەسایەتیت ون نەبێت

برای بەڕێز مامۆستا (( عبدللە مودەیفەر )) ی میدیاكار ، بۆ چاوپێكەوتنێكی (m b c) بانگی كردم ؛ داوای لێ كردم وەك بیرمەندێك قسەی بۆ بكەم و، گوتی: لەوێ جەنابی شێخ ، بە جەنابی دوكتۆر ناوت دێنم !

ئەمنیش لەبەر ئەوەی بە زگماك ڕەزامەندیی و چاوپۆشیم بەسەردا زاڵە ، قایل بووم و چوومە ستۆدیۆ .

خۆم خستە نێو دێوجامەی کەسایەتیی بیرمەندەوە، نەك کەسایەتیی بنەڕەتی خۆم کە کەسایەتیی زانستخواز، ئەدیب، ئامۆژگاریکارە و، لە ژیاننامەو ئامۆژگاریی و ئەدەب و ئەوبابەتانە دەدوێت . دەستی بە پرسیاران کرد دەربارەی واقیعی نەتەوە ، ئەمنیش زۆرم لە خۆم دەکرد تا بەشێوازی بیرمەندان وەڵامی بدەمەوە ، پێم گوت : دیارە ئەم بابەتە ڕەگێکی مێژووی هەیە و، بەڕابردووەوە بەندە ؛ پاشان هەر دەبێ لەسەر زەمینەیەکی هاوبەش گفت و گۆ دەگەڵ خاڵکی بکەین بۆ ئەوەی تێك بگەین و، هەر دەبێ پردگەلی گفتوگۆ لەنێوان خۆمان و نەتەوەکانی دیکە هەڵبەستین ، چونکە ئێمە قەیرانی دواندن ( **خطاب** ) مان هەیە و ، ئیدی بەو جۆرە دەستم بە زۆر لەخۆکردن و، قسە گەلی ئاوا قەبە ، کە لەگەڵ سروشت و زگماکی من نەدەهاتەوە و، زۆر سەیر و کۆمیدیی دەهاتە بەر چاو، کرد. سەرەنجام چاوپێکەوتنەکە شتێکی بێتام و سەیر دەرچوو؛چونکە بیری خۆم ڕادەگوشی و بە تۆبزیی قسەم لێ دەردەهێنان و، قسەکان هەموو زۆر لە خۆکردنیان پێوە دیار بوو .کاتێك زنجیرەکانی چاوپێکەوتنەکە – کە پێموایە سێ یان چوار بوون – تەواو بوون ، گەڕامەوە سروشتی بنەڕەتیی خۆم و، بەپێی زگماکی خۆم تێهەڵچوومەوە و دەستم کردەوە بە باسکردنی ژیاننامە و تەفسیر و حەدیس و ئەدەب و، هەستم کرد ڕووحی من لێرەیە، نەك لەوێ . جاپێویستە بە وردیی توێژینەوە لەسەر خۆت بکەی و، بەهرەکانی خۆت بناسی و، بە گوێرەی سروشت و زگماگی خۆت هەڵسوکەوت بکەی و، زۆر لە خۆت نەکەی و، لاسای کەس نەکەیەوە؛ چونکە خوا تۆی بە کەسێکی جیاواز و سەربەخۆ دروست کردوە؛ کەواتە : دەستکاریی خۆت مەکە و خۆت مەکە فلان و فیسار و تەنها خۆت بە .ئەگەر ئەو بەهرانەی خوا پێی بەخشیوی ، بیانخەیە کار و وەبەریان بێنی ، دەبیە کەسێکی لێهاتوو وسەرکەوتوو ؛چونکە بەهرەو تواناکانی خۆت ناسیون و، بۆ گەیشتن بە سەرفرازیی و سەرکەوتن ، سوودت لێ وەرگرتوون .

## ژیانی شافیعیی بەسەرهاتی سەرکەوتن و تێکۆشانە

ئەگەر بە هەتیویی گەورە بووی ، خەم موخۆ و، دڵتەنگ مەبە؛ چونکە لەوانەیە هەتیویی ڕێی سەرکەوتن و بەختیاریی بێت . شافیعیی لە زگی دایکیدا بوو، کە بابی مرد ، دایکیشی بە هەژاریی و نەداریی لە غەززەوە بردیە مەککە ؛ لە دنیادا هیچی شك نەدەبرد و، کەسیشی نەبوو ژیانی خۆی و کوڕەکەی دابین بکات . ژوورێکی چووکی لەمەککە بەکرێ گرت و، ئەو کوڕە بلیمەتە ناودارە ؛ ئیمامی شافیعیی لەو ژوورەدا گەورە بوو و، هەر لە منداڵیەوە دەستی کرد بە گەڕان بە دوای زانستدا و، تابلۆ و تەختە و ڕۆژنامە و پێستی کۆدەکردەوە و، ئەو زانستانەی لە مزگەوتی حەرام دەیخوێندن ، لەسەری دەنووسین و، ئەو ڕۆژنامەو تابلۆ و پێستانەی لە ژوورەکەیدا دا دەنان ، تا وای لێهات بە عاستەم جێی خۆی و دایکی تێدا دەبۆوە .... دایکی پێی گوت: موحەمەد، هەر ئەوەندە ماوە بچینە کۆڵانێ و ژوورەکە بۆ تابلۆ و تەختەکانی تۆ بەجێ بێڵین ! قسەکەی دایکی زۆر کاری تێکرد ، بۆیە دەستی

بەلەبەرکردنی ئەو شتانە کرد ، کە لەسەر تابلۆ و تەختەو پێستەکان نووسیبوونی و ، هەمووی بەتەواویی لەبەر کردن، پاشان هەمووی سووتاندن و لە شیعرێکیدا گوتی :

علمي معي حيثُ ما يمّمتُ يتبعني
قلبي وعاءٌ لا بطن صندوقِ
إن كنت في البيت كان العلمُ فيه معي
أو كنت بالسوقِ كان العلم بالسوقِ

لە هەر کوێ بم، لەگەڵ خۆمە زانستم
لەدڵمدایە و بەردەوام لەنێو مستم
لەماڵێ بم، زانستیشم لە ماڵە
لە بازاڕیش زانستم هەر ئاواڵە

پاشان سەرچاوەکانی زانست و حیکمەت و تێگەیشتن و هەڵێنجانی تەقینەوە و ، ڕێژنەیەك زانستی خوایی پێغەمبەریی لە ئاسمانی کتێبە شاکارەکانی وەکو (( **الام** – دایك )) و (( **الرسالة** – پەیام)) و ئەوانی دیکە ، داباری و ، بوو بە پێشەوایەکی دیاری ئایین ولە هەر نەوەیەك ملیۆنان کەس لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهان ، بوونە شوێنکەوتووی و، بوو بەمامۆستایەکی قامك نیشانی نەتەوە ، کە نموونەی تێگەیشتن و هەڵێنجان بوو . ئەمە ئەو هەتیوە بوو بەهەژاریی و دەست کورتیی و نەداریی گەورە بوو، بەڵام بەشێلگیریی و توندیی و بەهێزیی ڕێگەی ژیانی بڕی . جا خەم بەو ڕەوشە سەخت و تەنگانانەوە مەخۆ تووشت دەبن؛ چونکە ڕەنگە ڕێگای سەرفرازیی و سەرکەوتنی دنیا و دواڕۆژت بن و، پشت بەخوا ببەستە و بەردەوام بە و، متمانەت بە پەروەردگارت هەبێت و ، ئەوەندە خەریکی خۆشگوزەرانیی و شت کۆکردنەوە مەبە ؛ چونکە ڕەنگە ببنە لەمپەری ڕێی بە ڕابەر بوون و لە گەیشتن بە ئامانجەکانت ساردت کەنەوە ؛ تۆ نازانی ، چونکە بژاردەی خوا لە بژاردەی خۆمان بۆ خۆمان باشترە .

## لووتکەکان بۆ خەڵکی بەهیمەتن و، نزمایيش بۆ خەڵکی کەمتەرخەم و سەرگەردان

بازرگانێکی سعوودیی بە فەقیریی و نەداریی و هەتیویی گەورە بوو ، خۆی و دایکی ژیانیان زۆر سەخت بوو ، لە ماڵی خۆیان ، کە لە دێهات بوو ، وەدەرکەوت و لەگەڵ چەند کەسێك ، کە بە خۆڕایی سواری سەیارە کۆنەکەی خۆیان کرد ، بەرەو ( ڕیاز ) ی پایتەخت کەوتە ڕێ و، گەیشتە جێ ، ئەوە نزیکەی شەست ساڵ لەمە و پێش بوو .

لەوەرشەیەك دەستی بەکار کردن کرد ، پاشان بوو بە کرێکاری بیناسازیی ، دوایی بوو بە بازرگانی زەوی و زار و، دوای گەلێك کڕین و فرۆشتن ، قازانجێکی زۆری کرد ، پاشان سامانەکەی ئەوەندە زیادی کرد ، ئەنگڕا و، بوو بە خاوەنی چەندەها خانوو و کۆشك و تەلار و کۆمپانیا و زەوی و زار ، کە هەر لەباسکردن نەدەهات ، لەهەموو

لایەکەوە ڕۆزیی و ماڵی دنیای بەسەردا باری و، نموونەی بەخشین و خێر و خێرات و سەرپەرشتی کردنی هەتیوان و، دروستکردنی مزگەوتان بوو . بەهۆی ماڵ و سامانەکەی، بەختەوەر بوو و، نەبۆ بەندەی ماڵ و سامانەکەی ؛ بەڵکو بەخشندە و سەخیی بوو و، بەوەی خوای گەورە پێی بەخشی بوو خەیاڵ ئاسوودە و دڵکراوە و شادمان بوو ، مافی خوای لە سامانەکەی بەتەواویی بەجێدەهێنا . جا بەو گەردەلوولانەی لە ژیانتدا لێت دەدەن سەغڵەت مەبە ، چونکە ڕەنگە بۆت ببنە مشتوماڵ و پوخت کردن و گورج و گۆڵ کردن و تەمبێ کردن و ئامادەکردن بۆ کاری گەورە و پێهەڵاچوون بە پەیژەی سەرفرازیی و سەرکەوتن و داهێنان و بەرهەم هێناندا ؛ کەواتە: تۆ هەر ئەوەت لەسەرە هەوڵی خۆت بدەی و  پشت بە پەروەردگارت ببەستی و ، ئیشەکەت بە ڕێکو پێکیی بکەی و ، بەدوای سەرچاوەکانی خێردا لە زانست و ڕۆزیی و کەڵك و سوود، بگەڕێی و، سست و خاو و تێشکاو نائومێد و نەبی و سارد نەبیەوە و ، پشت بە خوا ببەستی؛چونکە خوا ئەو کەسانەی خۆشدەوێن کە پشتی پێ دەبەستن .

## گەنجێکی تەواو نەقوستان ، گەیشتە موعجیزە و بەرهەمهێنان

ئەو گەنجەم لە( ڕیاز)ی پایتەخت ناسی ، لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا نە قوستان بوو بوو، لەسەر کورسی هاتوچۆی دەکرد، بەڵام گیانی پڕ لە ئومێد و هیمەتی بەرزیی، بە پێچەوانەی لەشی ، بە ئاسماندا دەفڕین ، وەخۆ کەوت و قورئانی مەزنی بە جوانیی لەبەر کرد ، چووە زانکۆ ودوکتۆرای وەرگرت و، بوو بە نموونەی پێگەیشتن و سەرکەوتن . زۆربەی ئاواڵەکانی بە شەهادەیەکی نزم قنیاتیان کرد و ، کارێکی سادەیان گرتە دەست، بەڵام ئەو پیاوە لەسەر پێی خۆ دامەزراوە ، ڕوخساری بە نوور و شادیی شوێنەواری کتێبی خوا و ڕێوشوێنی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وسلم**) دەدرەوشێتەوە و، کاتێك تووشی ئیفلیجی بوو، ئەوەندەی خوێندەوە، زانیارییەکی زۆری کۆکردەوە و ، وەزیفەیەکی لەباری وەدەستهینا و، دەستی بە گوتنەوەی دەرسی تایبەتیی و گشتیی کرد، نەخۆشییەکەی نەیتوانی پەکی بخات و، ڕێی سەرکەوتنی لێ بگرێت . بەڕاستی ئەمن دەیبینم لە ملیۆنان کەسی کە بە پێی خۆیان دەڕۆن و عەلەمیان لێ نییە ، بەڵام دڵەکانیان تەپن و، بیر و هۆشیان وەستاوە و، گیانیان سست و خاوە و، بەدوای زانستدا نەگەڕاون و سامانێکیان کۆنەکردۆتەوە و، سەرکەوتنێکیان وەدەست نە هێناوە ، جا پێت وا نەبێ پەك کەوتنی لەش، ڕێی بەدەست هێنانی سەرفرازیی و سەرکەوتن و خێرو چاکەو ڕۆزیی پەیداکردنت  لێ دەگرێت ، چونکە خوای گەورە لەگەڵ بەندەکانی میهرەبانە و، ئەگەر شتێك لە بەندەکەی بستێنێت ، بە شتێکی چاکتر بۆی تێهەڵدێنێتەوە ، کەواتە: بە بژاردەی خوا قایل بە و، نیعمەت و بەهرەکانت بخە کار و پشت بەخوا ببەستە ؛چونکە شتیکی زیانبەخش ڕەنگە سەرەنجام سوودی هەبێت و، وەخێر بگەڕێ و، کاتێك کەسێك تووشی شتێك دەبێت؛ تۆ نازانی نهێنیی قەزا و قەدەر چییە . کەواتە: لە هەموو ڕووداوێکدا لایەنە چاکەکان ببینە و، ڕووح گەش و ڕووخۆش بە و، بەکاری خوا ڕازی بە و، پشت بەوی ببەستە .

## منداڵێکی بێلاق بۆتە هێمای داهێنان و سەرکەوتن

پاش ئەوەی نەشتەرگەری ئەژنۆیانم لە (( میوونیخ)) کرد ، لەفڕۆکەخانەی (( فرانکفۆڕت )) ڕاوەستابووم ، چاوەڕوانی گەڕانەوە بۆ ڕیاز بووم ، تەماشام کرد منداڵێکی سعوودیی لەسەر عەرەبانەیە و برایەکی گەورەی لەگەڵە ، پاڵی پێوە دەنێت ، لەمنداڵە چکۆڵەکە وە نزیك کەوتم و سەلامم لێ کرد و ماچم کرد ، سەیرم کرد هەردووك لاقی لەژنۆ ڕا بڕاونەتەوە . سەتحی بووم و تووشی حەبەسان (( شۆك )) ێکی دەروونیی بووم و، دەستم بە دوعاکرد و، ڕووم لەو دیمەنە ناخ هەژێنە وەرگێڕاو، لە خوا پاڕامەوە چاودێریی و بەزەیی پەنهان و ئاشکرای خۆی پێ ببەخشێت . پاشان پێکەوە سواری فڕۆکە بووین و ، دوای هەڵفڕین چوومە لای منداڵەکە ، دەبینم بیستەك ( سەعاعە)ی دەگوێی کردوە و گوێ لە قورئان دەگرێت ، لەمەڕ ژیانی پرسیارم لێ کرد ، گوتی : مزگێنیت لێ بێ ، قورئانم وەك ( فاتیحە ) لەبەرە و، گەلێك حەدیسی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) یشم لەبەرە و، بەردەوام دەخوێنمەوە؛ ئیدی دەستی بە گوتنی ناوی کتێبان ، لەگەڵ ناوی نووسەرەکانیان کرد، گوتی:مژدەشت دەدەمێ لە پۆلەکەشمدا یەکەمم و ، چەندان خەڵاتم وەرگرتوە . تەماشام دەکرد لەو پەڕی دڵخۆشیدایە و، هەتا بڵێی بەختەوەرە. بڕینەوەی لاقەکانی بە هیچ جۆرێك کاری نەکردبۆ سەر ژیان و دەروونی و، لە هەموو ڕێبوارانی نێو فڕۆکەکە لێو بەبزەتر وڕووخۆشتر و ئاسوودەتر و دڵخۆشتر بوو .پاك و بێگەردیی بۆ پاشای کارزان کە هەر شتێك لە عەبدەکەی وەرگرێتەوە ، بۆی تێهەڵدێنێتەوە و، شتێك لە جێی شتی وەرگیراو هەر دادەنێتەوە و، فەرمانی ڕەتناکرێتەوە و، کەس ناتوانێ وشەکانی بگۆڕێت و قسەی لە قسە بکات . کەواتە: پێویستە لەسەرت متمانەت بە هەڵبژاردن و بژاردەی پەروەردگار هەبێت و، لە پەرستنی ئەو زاتە مەزنەدا ڕاست بی و، لەهەموو ئیشێك پشتی پێ ببەستی و، بزانی کە تەکبیرێك کە ئەو بۆمان دەکات، لەو تەکبیرەی ئیمە بۆخۆمانی دەکەین، چاکترە .

## لەپەناو پەسیوەکانی ڕووح و لەشت بەختەوەریی بدۆزەوە

بەدوای بەختەوەریدا بگەڕێ، لەخۆتدا دەیبینییەوە، چونکە ئەو لێت دوور نییە ؛ زۆر نزیکە، لە بیری گەش و جوانتدایە؛لە زەینی داهێنەرتدایە،لە ڕووحی گەشبینتدایە . لە لەشی بەهێزتدایە، لە دڵی فرەوان و کراوەتدایە، لەو بەهرەی زیرەکییەتدایە کە خوا پێی داوی، لە زمانی ڕەوانتدایە، لە تێڕامانی قووڵتدایە، لە زەینی ڕوون و یادگەی بەهێزتدایە، لە چالاکیی و ئومێدتدایە . لەپەرستنی خوای پاکو باڵاتدایە، لە کڕنووشێکی ملکەچانە دایە ، لە فرمێسکێکی سەخاوەتمەندانەدایە، لە پاڕانەوەیەکی تەنهای بەسۆزدایە، لە بزەیەکی دلگیردایە، دەتوانی هەموو جووڵەو ڕاوەستانێکی ژیانت بکەیە خوا پەرستیی، دەتوانی عادەتەکانت بکەیە عیبادەت، دەتوانی هەنگاوەکانت بکەیە خێر وچاکە ، دەتوانی پاروو نانەکانت بکەیە شوکرانە بژێریی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان ! کەواتە بەوەی خوا پێی داوی، دڵخۆش بە ((**قُلْ بِفَضْلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ** – بڵێ: بە چاکەی

خوا و ڕەحمەتەکەی ، با بەوە دڵخۆش بن ، ئەوە چاکترە لەوەی کۆی دەکەنەوە )) **یونس** ( ٥٨ ).. ئەو بەهرانەی هەتن ، وەبەریان بێنە ؛ چونکە کەمیش بن، هەر زۆرن، لە کۆختەشدابی، وابزانە لە کۆشکدای ، بابەتەکە بابەتی خەیاڵی داهێنەرە . ئەگەر لە ژوورێکی تەنگیشدابی، وابزانە لە خانوێکی فرەوان و کۆشکێکی بەرزدای، بابەتەکە لەدەستی بیرکردنەوە دایە ، تۆ چووزانی؛ لەوانەیە خاوەنی ئەو کۆشکە گەورە و فرەوانە ، هەتا بڵێی بێزار و دڵتەنگ بێ و، لەبەر تاوانەکانی تەنگاو بێ و، نەخۆشیی ژیانی لێ تاڵ کردبێ ! تۆ نازانی بەختەوەری لەکوێیە ! ڕەنگە بەختەوەریی لەگەڵ ئەو مرۆڤە سادەیە دەبێت کەخەریکی ئاودانی کشتوکاڵەکەیەتی ، یان مەڕەکەی دەلەوەڕێنێ ، یان کۆڵە داری پێیە، یان ماڵێ دەماڵێ ، یان نەعلەکەی دەدروێتەوە، یان جلکەکەی پینە دەکات ! بەختەوەریی پاوانی دەوڵەمەندان یان هەژاران، یان سەرکردە و زانایان نییە ؛ بەختەوەریی بەخششی خوای پاك و باڵایە ، دەیخاتە دڵی هەرکەسێك کە بیەوێت و، سەرەنجام ڕووناکیی و شادیی دەداتە دەوروبەری و، کات و شوێن دەخاتە بەر شۆقی خۆی و دۆست و جیرانی پێ بەختەوەر دەبن . بەدوای بەختەوەریدا بگەڕێ، دەبینی زۆر نزیکە ؛ نزیکتر لەوەی بە خەیاڵتدا دێت؛ هەر لەبنەو پاڵە وەیە !

## پێهەڵاچوون دووبارە بکەوە ، پێهەڵادەچی و بەدوای بەختەوەریدا بگەڕێ ، بەختەوەر دەبی

لە زانکۆ قورئانم لەبەر کرد، بەڵام سەفەری زۆر و شیعر لەبەر کردن، زۆری لەبیر بردمەوە و، وامدەزانی تازە قەت نایەتەوە بەرم، دەمگوت: ڕەنگە وەنێو کەوتبم و، وام لە دڵی چەقیبوو کە ئەو کەسەی لە پەنجا ساڵ تێپەڕی، قورئانی چاك پێ لەبەر ناکرێ ! پاشان بیستم کە لە شاری جددە (شارێکی گەورەیە لەسعوودیە)، لەلای شێخ (( مووسا جارووشە )) تەنانەت پیر و بەساڵاچووانیش، ئەوانەی لەمنیش بەتەمەنترن و لە حەفتاش باڵان، بە جوانیی قورئان لەبەر دەکەن. ناوی خوام لێ هێنا و، چوومە خزمەت مامۆستای سەنگین، مووسا جاڕووشە و شەرتم کرد قورئان لەکن وی لە بەر کەم و، دەستم پێکرد؛ هەر ڕۆژەی بەشێکم لە بەر دەکرد و، داوام لێ دەکرد هەموو ڕۆژێ لە لەبەر کردنەکەم دڵنیا بێ و لەگەڵم پێدا بچێتەوە ... جا لە ڕێگەوبان و لە کۆڕ و مەجلیس و پێش نوستن و دوای نوستن، بەردەوام دەمگوتەوە . تەنانەت ڕەمەزانێ کە چوومە مەککە، خۆشەویسترین ئیشم ئەوە بوو وا بکەم قورئانم بێتەوە بەر و، بۆ ئەم مەبەستە دەستم کرد بەدوعاو لەخوا پاڕانەوە ، ئەوە بوو خوا بۆی ئاسان کردم و،

سوپاس بۆ خوا هاتەوە بەرم و،بەسادەو ئاسانیی دەورم دەکردەوە و، بەرِەوانیی ئایەتەکانیم بە نموونە دەهێنانەوە و، زانیم ئەوەی لەسەر شتێك سوور بێت و خۆی بۆ یەکلاکاتەوە، خوا رِێی ئەنجامدانی نیازی چاکی بۆ خۆش دەکات. کەواتە: لەهیچ هەوڵدانێك بێ هیوا مەبە و، پێهەڵچوون بەرەو کارە باڵاکان دووبارە بکەوە و، دەرگای ئومێد لەخۆت دامەخە و، دڵسارد مەبە و، بڕیاری بێتوانایی و دەستەوستانیی خۆت مەدە ، پشت بەخوای تاك و تەنها سەردەکەوی و، ئەگەر پشت بەخوا ببەستی و بە هیمەت و متمانەوە بکەویە رِێ ، چت بوێ ، وەدیی دێنی .

زۆر کەس هەبووە هەوڵی شتی قورستریشیان داوە، بەڵام بۆیان ئاسان بووە و پێی گەیشتوون و، هەر لە کۆمەڵی خۆماندا، بابای بەساڵداچووم دیتوە بڕیاری داوە فێرە ئینگلیزی بێت، فێربووە. سەربازێکی زۆر پیرم دی، لەفەرِەنسا چووە خولی فێربوونی زمانی فەرِەنسیی، بە چاکی فێر بوو.کەواتە: پشت بە خوا ببەستە و، خۆت یەکلا بکەوە و، متمانەت بە خوا هەبێ و خۆتی پێ بسپێرە ، مژدە بێ و پێهەڵدەچی و، دەگەیە ترۆپکی بەختەوەریی .

## پیرەژنیك بوو بە رابەر و گەیشتە بەختەوەریی

ئێزگەی قورئانی پیرۆز رِایگەیاند کە پیرەژنێك لە پارێزگایەکی سعوودیە لەدوای تەمەنی حەفتا ساڵیی ، دەستی بەقورئان لەبەرکردن کردوە !هەرچەندە نەخوێندەواریشە، بەڵام زۆر بەجوانیی لەبەرکردوە و، بێ لەبەر دەیلێتەوە و ، بەردەوام بە پێوە و بەدانیشتنەوە و بە رِاکشانەوە، دەیخوێنێ. رِاشیگەیاند کەپێشتر نیگەرانیی و خوتخوتە (وەسوەسە)ی هەبووە و،کەسێك رِێی نیشانداوە کتێبی خوای گەورە لەبەر کات، ئەویش زۆر بەجوانیی لەبەری کردوە ! ئەوەش هەمووی بەهۆی سەبرو یەکلابوونەوە و بەردەوامیی، جا تەماشاکە چۆن هەم رِابەرایەتیی بەدەستهێناوە، هەم بەختەوەریی !رِابەرایەتی لەگەورەترین دەستکەوتدا، کەلەبەرکردن و خوێندنەوەی کتێبی خوایە، لەکات و ساتەکانی شەو و رِۆژدا و ئیش پێ کردنیشی . بەختەوەریش بەهۆی رِەواندنەوەی تەمی خەم و خەفەتی؛چونکە خوا دەفەرموێ: ((**أَلاَ بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُ الْقُلُوبُ — ئاگادار بن کە دڵەکان بە یادی خوا ئارام دەگرن** )) **الرعد** ( ٢٨ ) . گەورەترین یادی خوای پاك و بێگەردیش، خوێندنەوە و تێرِامان و لەبەرکردنی قورئانە .

تەماشاکە چۆن هیمەتی بەرز، خاوەنەکەی دەگەیەنێتە لووتکە .

## لەمانای ژیان گەیشت و کاتی خۆی وەبەرهێناو خەم و خەفەتی بنەبڕ کرد

شێخ (د. سەعیدی کوری موسفیر) بۆی گێرِامەوە ، گوتی: لە کەعبە کۆتاییەکانی سورەتی ( نیساء) م دەخوێند ، پیاوێکی تەمەن هەشتا ساڵم لەپەنا بوو ، هەر هەڵەیەکم کردبا، بە وردیی بۆی راست دەکردمەوە ، ئەوکارەی چەندان جار دووبارەکردەوە ، ئاورِم لێ دایەوە و شێوازێکی پەرِپووتی هەبوو و، شوێنەوەرای لەخۆ گرتنەوە و دنیا

بەكەم گرتنی پێوە دیار بوو ، لێم پرسی : قورئانت لەبەرە ؟ گوتی : لەسایەی خواوە وەك ( فاتیحا)م لەبەرە و، یەك هەڵەی تێدا ناكەم !پێم گوت:چۆنت لەبەر كرد ؟ گوتی: لە نەجد، لە كن میرێكی برادەرم فەرمانبەر بووم ، پاشان دەستم لەكار كێشایەوە و خەریكی حوشترەكانم بووم ، بڕیارمدا قورئان لەبەركەم و ، ئیدی شەو و ڕۆژ ئیش و كارم بوو بە قورئان لەبەركردن ، حوشترم دەلەوەڕاندن ، قورئانم هەر پێ بوو ؛لەنێو فرۆكە و ترومبێلدا قورئانم هەر پێ بوو، تاوای لێ هات هەمووم وەك سووڕەتی (فاتیحا ) بەجوانیی لەبەر كرد و، پێویستم بەوە نەبوو قورئان هەڵگرم ، ئیدی شەو و ڕۆژ لەماڵێ و لەسەفەرێ، بە پێوە ، بە دانیشتنەوە ، بە ڕاكشانەوە .... هەر دەمخوێندەوە .

پاشان گوتی : بەخوا هیچ خەم و خەفەت و ناخۆشیم نەما .. داوام لە خێزانەكەم و منداڵەكانم و كەس و كارم كرد لێم نەگرن كە ئامادەی كۆبوونەوە و سەردانیەكانیان نابم ؛ چونكە قورئان بۆتە هەموو سێبووریی و دڵدانەوەیەكی ژیانم، ئیدی هیچ هەستم بە بۆشایی نەدەكرد و خەم و خەفەتم نەما و، لە ماڵێ و لە سەفەرێ ، تام و چێژێكی زۆر لەخوێندنەوەی وەردەگرم، هەر جارێك خەتمی بكەم ، لەسەرڕا دەست پێ دەكەمەوە، ئەوەیە بەختەوەر و دڵخۆشی كردووم و ، یادگەی بەهێز كردووم و بۆتە دڵنەوام و ، وای لێ كردووم بیر لە ملك و ماڵ و زەوی و هیچ نەكەمەوە و ، تەنها بیر لەو كتێبە مەزنە بكەمەوە كەبەردەوام لەگەڵم بێ و لەگەڵی بم ، چونكە باشترین هاوڕێ و هاونشین و دڵنەوایە .

## هیمەت لەدڵی خەڵكی گەورەدا گەورە دەبێت و لەدڵی خەڵی بچووكدا بچووك دەبێتەوە

جەنابی شێخ (د.عبدللەی كوڕی عبدولحسینی )توركیم ناسی ، كە بەڕێوەبەری زانكۆی ( ئیمام ) بوو ، پاشان وەزیری كارو باری ئیسلامی ، دوایی ئەمینداری پەیوەندیی جیهانی ئیسلامیی .سەردانم كرد و ماوەیەك دەگەڵی بووم، دیتم هیمەتی ڕۆژ لە ڕۆژێ بەرزترە و، لەگەڵ زیاد بوونی تەمەنی ، زیاد دەكات ؛كاروباری ژیانی زۆر بە جوانی ڕێكخستوە؛ مافی خوا جێ بەجێ دەكات، لە خوێندنەوە و لێكۆڵینەوەی بەردەوامە و لە نووسینگەكەی دەوام دەكات ، پێشوازیی میوانەكانی دەكات ، سەرپەرشتیی خێزانەكەی دەكات ، ئەوەندەی پرۆژەگەلی زانستیی جیهانیی هەن ، هەر باسیان ناكرێ ؛ سەرپەرشتیی ساغكردنەوەی كتێبە هەرە بنەڕەتییەكانی ڕێوشوێن ( سنە )ی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** كردوە، وێڕای چەندان كتێبی گشتگیری بە سوودی دیكەی وەكو:**(المغني)**، مەوسووعەی كتێبەكانی حەنبەلییان ، ( **سنن البيهقي** ) تەفسیری **(قرطبي)** ، ( **الدر المنثور** ) و ( **البداية و النهاية** ) و زۆری دیكەش . هەتا تووشی دەبووم، سەیرم دەكرد بیر لە پرۆژەیەكی دیكە دەكاتەوە، كە بۆ مسوڵمانان بەسوودترو، شوێنەواری لە ژیانیاندا زیاتر بێت ، قەت خۆی بە وەڵامدانەوەی دوژمنانی سەركەوتنەوە خەریك نەدەكرد و، هەر گوێی نەدەدانێ، بەڵكو وەك هەڵۆیەك كە بۆ تەشقی ئاسمان بفڕێت و باوەڕی بەتێكهەڵچوون دەگەڵ قەلان نەبێت ، هەر لە بەرز بوونەوەدا بوو . زۆریش مشووری تەندروستیی خۆی دەخوارد ، یەك لە هاونشینەكانی بۆی گێڕامەوە كە لەسەفەردا خواردنێكی كەم دەخوات، كە بە زۆریی ماسی برژاوە و، كارە نزیكەكانی هەر بە پێیان دەچێ

دەیانکات، ڕۆژ هەیە پتر لە دوو سەعات بە پێ دەڕوات و، بەو جۆرە تەمەنی نزیکەی هەشتا ساڵە و ، تەندروستیی خۆی پاراستوە و، پەیامێك کە دەبێ لە ژیاندا ئەنجامی بدات، بە چاکیی ئەنجامی داوە. سەرباری ئەوە ، دەبینی لە کۆڕ و مەجلیسدا، هێمن و دڵنیا و لەسەرخۆیە و، لە قسەکردندا دەنگی نزمە و، کارو باری ڕێك دەخات و، لەگەڵ دەوروبەری نەرم و نیان و بەسۆز و سادە و خاکییە . کەواتە: با بەو جۆرە سەرکەوتن دروست بکرێت و، سەرفرازی دنیا و قیامەت وەدیبێت و، بەو چاکە و هیمەتە تەمەن بەسەر بچێت و ، شەو و ڕۆژ بگوزەرێنرێن . لەبەرئەوە خەفەت بۆ تەمەنی بەسەر چووت مەخۆ ، بەڵکو تا تەمەنت زیاتر دەبێت ، با هیمەتت بەرزتر بێت ، چونکە زیاتر تێدەگەی و، ئەزموون و زانیاریت لە مەڕ ژیان لەجاران پتردەبێت ، کەواتە : درەوشاوە و ورشەدار بە؛چونکە ئەسپ کە لەکۆتایی نزیك بۆوە ، زیاتر دەخۆ دەنووسێت و، توندتر هەڵدەکاتە غار !

## کاری چاك لە دنیا و قیامەتدا بەختەوەرییە

کە لە خەستەخانە بووم، پیاوێك سەردانی کردم لەمێژ بوو دەمناسی؛ پیاوێکی سەخیی و خێرۆمەند و چاکەکار بوو ، لەڕووی خێر و بەخشین و دروستکردنی مزگەوت و سەرپەرشتیی هەتیوان و دەستگرتنی هەژاران، لەبازرگانە مسوڵمانە هەرە چاکەکان بوو لە وڵاتانی مسوڵماننشیندا . ئەوەی لە ژیانی ئەو پیاوەدا جێی سەرنجم بوو ، ئەوە بوو کە سەرباری ئەو هەموو ماڵ و سامان داهاتەی خوا پێی دابوو ، دنیا نەبوو بوو بە دڵنشینی . تەنانەت وەقفێکی کرد بە زیاتر لە پەنجا ملیار و ، خوا بە سێ قات بۆی قەرەبوو کردەوە . ئەوەندە لەسەرخۆو بە ئاسوودەیی قسەم دەگەڵ دەکات ، وەك بڵێی بەعاستەم بەشی خۆی هەیە؛ چونکە بیری بە ژمارە و ژماردن و خزمەتکردنی ماڵ و سامان و بەندایەتیی درهەم و دینارەوە خەریك نەکردوە؛ بەڵکو خۆی بۆ خوا یەکلا کردۆتەوە و ، هەر خەریکی خێر و خێرات و بەخشین و میوانداریيە ، ئەوەش هەمووی بۆی بۆتە خۆشیی و شادیی و ئارامیی . گاڵتەو قسەی خۆشی زۆر بوو ، قسە بەدەست و فرە نوکتە بوو ، کۆڕ و مەجلیسەکانی بە بەسەرهات و قسەی خۆش دەڕازاندنەوە ، شەوێ بەئارامیی زوو لێی دەنووست و ، بەردەوام قورئانی دەخوێند .

هەندێك لە برادەرەکانی پێیان گوتم: بەردەوام سوننەت و شەو نوێژ دەکات و قورئان دەخوێنێ و، هەمیشە پێش نوێژ دابەستن دەچێتە مزگەوت و، لە ریزی یەکەم نوێژ دەکات. پاك و بێگەردیی بۆ پاشای ڕاستەقینە؛ هەرکەسێك بیەوێ هەر لە دنیادا دوا ڕۆژی دەداتێ و، هەرکەسێك حەزی لێ بێ و خێر و چاکەی بۆی بوێت ، کاری بۆ ئاسان دەکات . لەمەوە تێدەگەین: تۆ چەندە ببەخشی و خێر بکەی ، خواش ئەوەندە نوور و ئارامیی و خۆشیی و شادیت دەداتێ و، دڵت فرەوان دەکات و، کارت ڕاست دێنێ ؛چونکە پاداشت لەجۆری کارە ، وەکو لە حەدیسدا هاتوە:(( **فلا تحقرنَّ من المعروف شيئاً ولو أن تلقى أخاك بوجهٍ طلق** – لە چاکە ، هیچ شتێکت پێ کەم نەبێت، تەنانەت ڕووخۆشیت دەگەڵ براکەشت)) رواه **البخاري** ( ٨٩٢ ) . قسەی چاکیش هەر خێرە؛ کەواتە: لە خێر و چاکە بەردەوام بە ، شوێنەواری لە ڕووحتدا دەبینی .

## بەسەرهاتی من دەگەڵ کتێبی ( إحياء علوم الدين )ی غەزالیی

لە پۆلی یەکی ئامادەیی بووم ، لە بازاڕی پارێزگای ( بەلجەرشی) لە باشوور ، لە کتێبێك دەگەڕام سوڤودی لێ وەرگرم ، لە سەرەتای خوێندنمدا زۆر شەیدای خوێندنەوە بووم، کتێبخانەیەکی بچووك نەبێ ، نەمدۆزییەوە ، لەوکتێبخانەیە کتێبی ( احیاء علوم الدین – زیندوو کردنەوەی زانستەکانی ئایین )ی ئیمامی ( غەزالی )م دیت ، کڕیم و چوومەوە ماڵێ – بە حەز و تامەزرۆییەکی بێ وێنەوە هێنام لێکم کردەوە و تەماشام دەکرد؛ کتێبەکە بانگەوازێکی بەهێزی تێدایە بۆ دنیا بەکەمگریی و کەمخۆریی و گوێ بەڕوخسار نەدان و سادەیی و دەست پێوەگرتن لە خۆراك و پۆشاکدا .. منیش دەستم بە ئەنجام دانی ئەو شتانە کرد کە دەمخوێندنەوە ؛ خواردن و خەوم کەمکردەوە و ، بەشێوەیەکی فرەوان دەستم بە کردنی سوننەتان کرد ، تا وای لێهات کاری لە تەندروستیم کرد و، تووشی هەندێك ئازار و نەخۆشیی بووم ؛چونکە ئەوکارەم لە ڕێوشوێنی پێغەمبەر و ئاسانکاریی ئەو دوور بوو . دوای ئەوە لە زانکۆ چوومە کۆلێجی ( بنەڕەتەکانی ئایین )، ڕووم لە کتێبەکانی حەدیس کرد، وەکو:(**صحيح البخاري**)و (**صحيح مسلم**) و (**رياض الصالين** ).... ئیدی شارەزای ڕێوشوێنی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) و ئاسانکارییەکەی و گونجانی ڕێڕوونیەکەی لەگەڵ سروشت و هاوئاهەنگیی ڕێبازەکەی لەگەڵ ژیان بووم ؛ لەبەر ئەوە دووبارە چوومەوە سەر میانەڕەویی لە خواردن و خواردنەوە و خەودا و، بوومەوە هاودەمی شادیی و خۆشیی وئارامیی . دەمەوێ بڵێم : هەندێك قوتابخانە کەلەگەڵ ڕێبازی پێغیمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) ڕێکناکەون ، لەگەڵ دەروون سەختگیرن و ئازاری ڕووح دەدەن و ، داوای چەند ڕێوڕەسمێك دەکەن ، لە شەرعی خوادا نین و وەکو ڕاهیبی گۆشەگیری مەسیحیان دەچن ((**وَرَهْبَانِيةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ – گۆشەگیرییەکیش لەخۆڕا دایانهێناوە ، ئێمە لەسەرمان فەرز نەکردوون** )) الحدید(٢٧).

بەڵام ڕێنوێنی و ڕێوشوێنی ئەو ، ڕێك و بێ گرێ و گۆڵە ، سادە و ئاسانە و لەگەڵ سروشتی مرۆڤ کۆکە ؛ چونکە لەسەر هاوسەنگیی بنیات نراوە ((**إن لربك عليك حقاً، ولنفسك عليك حقاً، ولأهلك عليك حقاً،فأعطِ كل ذي حق حقه – – بێگومان پەروەردگارت مافی لەسەرتە و، بۆخۆشت مافت لەسەر خۆت هەیە و، ماڵ و خێزانیشت مافی لەسەرتە؛ جا هەر خاوەن مافێك، مافی خۆی بدەیە** )) **رواه البخاري** ( ١٨١ ) . جا ئامان ، تخوونی دوو ڕێباز نەکەوی : زێدەڕۆیی و پەرگیریی و سەختگیریی دەگەڵ خۆت و، کەمتەرخەمیی و بێ بەندوباری لە ئاییندا ؛چونکە ئاییینی خوا نێوە نجییە لە نێوان پەڕگیر و کەمتەرخەمدا؛ لەبەر ئەوە شوێنی سوننەت بکەوە و لەگەڵ خۆت ئاسانکار بە و ، لەگەڵ ڕووحت سادە بە و سەختگیر مەبە ؛خواپەرستیی کەم بکە و بەردەوام بە و، لەسەر ڕێوشوێنی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) بڕۆ ؛ چونکە کەشتیی نووحەو، ئەوەی بچێتە نێوی ،ڕزگاری دەبێت و، ئەوەی نەچێتە نێوی، بەهیلاك دەچێت .

# ڕازیبوون بە کاری خوا ، بەهەشتی سەرزەوییە

برادەرێکم تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوو و، حەوت ساڵان لەسەر جێی کەوت ، لەگەڵ ئەوەشدا کەسم نەدیبوو لەوی دڵخۆشتر و، بەکاری خوا ڕازیتر بێ ... هەتا دەچووومە لای، یان تەلەفۆنم بۆ دەکرد، بە گاڵتە و قسە خۆشەکانی دڵی پڕ دەکردم لە ئارامیی و خۆشیی و، متمانەی بە پەروەردگاری وخۆ بەخوا سپاردنی ، ڕووحی دەگەشاندمەوە .....

لەو ماوەیەدا ،لەسەر جێ و سەرینان کتێبی ( جامع السنه ) ی نووسیی ؛کە لە چاکترین و بەکەڵکترین کتێبەکانی سوننەتە لەم سەردەمەدا ، ئەوەندە گرنگە، جێی خۆیەتی هەموو مسوڵمانێك لەسەفەرێ و لە ماڵێ پێی بێت .

سەرباری ئەوە ، مامۆستا لەسەر زکر و قورئان خوێندن بەردەوامە و، ڕۆژی زیاتر لە پێنج شەش جزوو قورئان دەخوێنێ و، سەرقاڵی خوێندنەوەیە و، بەشداریی کۆڕو موحازەرە و، گرتەی ڤیدیۆ و تویتەر دەکات ؛ چونکە عەقڵ و دڵ و هیمەتبەرزیی و ئیمان و یەقینی بە پەروەردگاری پاك و بێگەردی، هەروەکو خۆیەتی . مەبەست ئەوەیە کەپێویستە بە قەزا و قەدەری خوا ڕازی بی ؛ چونکە تۆ ئەگەر بە کار و فەرمانەکانی خوا ڕازی بی ، ئەویش لە خواپەرستییەکەت ڕازیی دەبێت و، سەرەنجام چارەنووست فیردەوسی باڵا دەبێت ، کە لەوێ ((رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللّٰهِ – خوا لەوان ڕازییە و ئەوانیش لەخوا ڕازین ، ئەوانە کۆمەڵی خوان )) **المجادلة** ( ٢٢ )..

جەند جوانە ئەهلی بەڵاو ئازار و نەخۆشیی ، ڕازیی و ئارام و دەم بە پێکەنین بن !چونکە ئەوەیە ڕێگەی ڕاستی قبووڵ کردنی قەدەر و، ڕازیبوون بە ئیشی خوای بەرز و مەزن ، باشە ، ئەگەر لەخوا و حوکم و فەرمانەکانی ، بە تاڵ و شیرنەوە، ڕازیی نەبی ، چ دەکەی؟ چت پێ دەکرێ؟ چارەیەکی دیکەت هەیە؟ دەتوانی لە خۆتیان لادەی ؟ هەر شتێك بەسەرت دێت، تازە بڕاوەتەوە و، خوای مەزن و باڵادەست بڕیاری لەسەر داوە ، بۆیە ناچاری قبووڵی کەی و ، بە بژاردەی خوا قایل بی ؛ چونکە ئەو بەرژەوەندیی تۆ چاکتر دەزانێت ، لەبەر ئەوە ئەگەر دەوڵەمەندی کردی ، هەر ڕازی بە، هەژاری کردی هەر ڕازی بە ؛ لە خۆشیی و ناخۆشیی و لە هەژاریی و دەوڵەمەندیی و تەنگانە و فەرحانیی و ساغیی و نەخۆشیدا لێی ڕازیی بە؛ دڵنیایی و ئاسوودەیی و شادیت دەستدەکەوێت. دەگەڵ قەزا و قەدەر بڕۆ و، بە سینگێکی فرەوان ئەوەی خوا بەسەری هێناوی، قبووڵی کە و، دڵنیابە کە ناتوانی هیچی لێ بگۆڕی ، بەڵام دەتوانی ڕووحی خۆت بگۆڕی و خۆت حەواڵەی خوا کەی و بە هێمنیی و ئارامیی ئەوەی خوا بەسەرت دێنێ ، قبووڵی کەی ؛ ئەوکاتە دەبیە بەختەوەرترین و دڵخۆشترین و بەڕێزترین کەس ، چونکە بە کاری خوا ڕازی بووی و خۆت ڕادەستی پەروەردگاری گەردوون کردوە .

## زكرەكان لە مەترسیی دەمانپارێزن

پێش ئەوەی لە فلیپین تەقەم لێ بکرێت ، خوا کردی زکرەکانی ئێوارانم هەمووی خوێندن و ، گەشبین بووم کە ئەو قەڵایە دەمپارێزێ ؛ چونکە زکری خوای گەورەیە و، لە حەدیسی ڕاستدا هاتوە: زکرەکان زرێن و- بە ئیزنی خوا – لە مەترسیی و کارەساتی دەرودەروون دەتپارێزن و ، هیچ ڕۆژێك ئەگەر زۆرم زکر کردبێت و پشتم بەخوا بەستبێت و کاری خۆم بەوی سپاردبێت ، قەت پەروەردگارم پشتی بەرنەداوم. ئێستاش ڕووداوەکەم لەبەر چاوە؛ دەماچەی تەقەکەرەکە هەر یەك مەتر لێم دوور بوو؛ شەش گوللەی پێوە نام، سێم وێکەوتن ، شەش سەعاتی تەواو وا بێهۆش بووم گەیشتمە کەناری مەرگ و خوا حافیزیکردن لە ژیان ، پاشان بە سۆز و ڕوحمی خوا چا بوومەوە و، گەڕامەوە ژیان . مەبەستم لەم بابەتە ئەوەیە پێویستە بەو دوعاو زکرە شەرعییانەی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** فەرمانی پێکردووین، خۆمان بپارێزین؛ چونکە شوورە و قەڵای قایمن بۆ پاراستنمان لە مەترسیی و، خەم و خەفەت و پەشێویی و نیگەرانیی و بەڵاو کارەسات . هەمیشە و بەردەوام پەنا بۆ زکری پەروەردگارت بەرە ؛ چونکە لە ژیانتدا تەنها بە پشت بەخوا بەستن ئەمین دەبی و ، هەر بە زکری ئەویش دڵت ئارام دەگرێت . زۆرم دەربارەی ئەزموون و هەڵوێستی زیندووان بیستوە و، لەبارەی مردوانیش خوێندوومەتەوە، کە پەروەردگارمان بەهۆی ئەوەی یادی ئەویان کردوە و، کارو باری خۆیان بەوی سپاردوە ، پاراستوونی .... قورئانیش بۆمان دەگێڕێتەوە کە چۆن خوا پێغەمبەرانی خۆی : نووح و ئیبراهیم و مووسا وعیسا و ئەیووب و یەعقووب و یوونس و یووسف و داود و سولەیمانی ڕزگار کردوون .هەروا دوایین پێغەمبەر محمد **(صلى الله عليه وسلم)** ، خوا هەموویانی بەهۆی دوعاو زکرەکانیان و خۆ بەخوا سپاردنیان و، داواکردنی یارمەتی لە خوای گەورە ، ڕزگارکردوون . کارو بارت بە خوا بسپێرە و ڕوو لە پەروەردگارت کە و، لەسەر خۆپاراستن بە زکر و دوعا ، سووربە و، لە قەڵاکانی خوا و پارێزەرەکانی بێ ئاگا مەبە ؛چونکە ژیان پڕە لەمەترسی و کارەسات ، کە ئەگەر خوا ئاگادارت نەبێت و سەرپەرشتیت نەکات و نەتپارێزێ، لێیان قوتار نابی .

## گەشتەکەم دەگەڵ سووڕەتی بەقەڕە

نەخۆشییەکی بەئێش لەلای ڕاستم پەیدا بوو و، وەك خەنجەری ژەهراوی بە پەراسووانمدا ڕۆچوو ، پزیشکەکان لە چارەسەرم دەستەوستان بوون ، چوومە پێنج نەخۆشخانان ، چارەم نەکرا ، لە خەستەخانەی ( الحبيب ) خەوێنرام و، دواتریش لە خەستەخانەی **(دلة)** لە ڕیاز ، بەڵام بێ سوود بوو .. پاشان یەك لە زانا خواناسەکان پێی گوتم سووڕەتی بەقەڕە بخوێنم و، فوو لە شوێنی ئازارەکەم بکەم ؛ چونکە – وەکو پسپۆڕانی بوارەکە پێیان گوتم – ئەوە سیحرە ! گەڕامەوە ماڵێ و بە بیردکردنەوەوە دەستم بەخوێندنی سووڕەتی بەقەڕە کرد و، فووم لە جێی ئێشەکە

دەكرد، وردە وردە بە ئیزنی خودا چاك دەبوومەوە و، تەندروستیم ئاسایی دەبۆوە و، ئازارەكەم نەدەما و شیفام بۆ دەهات ، تا بەیەكجاریی ئەو نە خۆشییە سەختەی چەند مانگێك بێزاری كردبووم و، خەوی لێ حەڕام كردبووم و بە هیچ دەرمان و پزیشكێك چارەسەر نەكرا، نەما . دوایی بۆم دەركەوت ئێمە لەو كتێبە مەزنەدا، بەتایبەتی لە سووڕەتی بەقەڕەدا، دەرمان و شیفامان هەیە ، بۆیە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** فەرمووویەتی: ((**أنها لا تستطيعها البطلة** – بێگومان سووڕەتی بەقەڕە جادووگەرەكان دەرەقەتی نایەن )) **رواه مسلم** ( ١٨٧١ ) .

لە چەند برادەرێكی خۆشم بیستوە، كە سیحرییان لێ كرابوو ، هەندێكیان تووشی خەمۆكیی و نیگەرانی بووبوون ، بەردەوام ئەو سووڕەتە شكۆدار و گەورەیان خوێندوە و، خوا شیفای داون و چاكی كردوونەتەوە . جا داواتان لێ دەكەم، دەست لەم كتێبە گەورە هەڵمەگرن؛ چونكە ڕێنومایی و نوور و شیفا و پارێزەر و، سەرفرازیی و سەركەوتنی دنیا و دوارۆژە .

## قەڵەم و زمانت سەلامەت بن، دەگەیە پلەی چاكەكاران

برادەرێكم هەیە ، لە كۆڕ و دانیشتن و نووسین و كتێبەكانیدا ، خەسڵەتێكی زۆر جوانی هەیە ؛ زمان وقەڵەمی لە بریندار كردن و بەدگۆیی و قسەی ناشیرین و جنێو سەلامەتن و، تەنها لە زانست و ئامۆژگاریی و وشەی بە سوود و عەیب پۆشیی مسولمانان و بەرپەرچدانەوەی خراپە بە چاكە و، بڵاوكردنەوەی خێر و چاكەدا بەكاریان دێنێ .

كەسێك خراپەی دەگەڵ بكات ، ئەو بە چاكە و لێخۆشبوون و چاوپۆشییەكی جوان وەڵامی دەداتەوە ... ئەوەشی لە قوتابخانەی جەنابی شێخ عبدولعەزیزی كوڕی بازەوە - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - وەرگرتوە ، كە بەنەرم و نیانیی و سەبرگرتنی جوان و لێبوردەیی بەرانبەر خراپەی بەدكاران بەناوبانگ بوو و، بەو هۆیەوە دڵی ساغ و سەلیم بوو و، خەڵك بە چاكە باسیان دەكرد و ڕێزیان دەگرت . كەواتە : قەڵەم و زمانت مەكە مایەی بریندار كردنی بەندەكانی خوا و، مەیانكە نەشتەری ئابڕووی خەڵكی و،لەمەڕ ئابڕووی مسوڵمانان، تەنانەت كەمتەرخەم و تاوانبارەكانی وەكو ئێمە مانانیش ، لەخوا بترسە ، ئەگەر ڕەخنەیەكیشت لە كەسێك هەیە، بەشێوەی ئامۆژگارییەكی بەسۆز و نیەتپاكانە و بێ ناو زڕاندن پێی ڕا بگەیەنە ، بەڵام تۆ بچی زمان و قەڵەمت بكەیە ئامرازی تۆڵە كردنەوە و بریندار كردنی بەندەكانی خوا و بەدناو كردنی خەڵكی ، ئەوە پێچەوانەی ئاكار و ڕەوشتی پێغەمبەر و ڕێنومایی قورئانی مەزنە . زمانت بپارێزە و قەڵەمەكەت هەڵگرەوە و، لەبەر گوناحەكانت بگری و، بەدوای عەیبەكانی خۆتدا بگەڕێ و، خەڵك بۆ خوا لێگەڕێ كە دروستی كردوون و، ئەگەر ئامۆژگارییەكیشت هەبوو، ئەوە لە چوار چێوەی ڕەوشت و ئاكار و نیازپاكیدا ئەنجامی بدە . خوا لە ئێمە و هەموو مسوڵمانان خۆشبێت.

## دانیشه و لیستەی نیعمەتەکانت بژمێرە

دانیشتنێك هەیە لە ژیانمدا تاقیم کردۆتەوە ، هەموو جارێ بە دڵخۆشیی و شادمانیی و ویژدانی ئاسوودە لێی هەستاوم ؛ ئەویش ئەو دانیشتنەیە تێیدا سەر تا خوار دەست بە ژماردنی نیعمەتەکانی خوا دەکەم ؛ نیعمەتی ئیسلام و ڕێنومایی کرانم لە نێوان ملیاران خەڵکی گومڕادا لەلایەن خواوە و، سەرخرانم بۆ ئەوەی باوەڕ بێنم و، شایەتمان بێنم و بڵێم : لەخوا بەدەر هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە و، موحەمەد نێرراوی خوایە ، پاشان بیر لە نیعمەتەکانی ئیسلام دەکەمەوە ، وەکو : نوێژ و ڕۆژوو و یادی خواو قورئان خوێندن و، شوێنکەوتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**)... تا کۆتایی لیستەکە .دوای ئەوە بیر لە نیعمەتی ئەندامەکانی وەکو: دڵ و گوێ و چاو و ئەوانی دی دەکەمەوە . پاشان بیر لە نیعمەتی بژێوی و ڕۆزیی و، ئەو خواردن و ئاو و دەرمانەی خوای گەورە داویەتی و ، نیعمەتی خانوو و، نیعمەتی ئاسایش و عەیب پۆشیی و ماڵ و منداڵ و.. هتد دەکەمەوە .

هەندێك جاریش دەچمەر سەر درێژەی ئەو نیعمەتانە و، ئەوە وەبیرخۆم دێنمەوە، کە چۆن خوا لە بەڵا و کارەسات و قەیران پاراستوومی و، چۆن ئەو زاتە باڵا دەستە لە چەندان هەڵوێستی سەخت و مەترسیدار قوتاری کردووم و، هەندێك زانستی بەکەڵکیشی پێ بەخشیوم و ، لە ئایین شارەزای کردووم و، خوێندنەوە و ئامۆژگاری کردنی مسوڵمانانی لەلا خۆشەویست کردووم ... تاکۆتایی نیعمەتە شکۆداروگەورەکانی خوا . جا داوات لێ دەکەم ڕۆژی چەند خولەکێك دیاری بکەی بۆ بیرکردنەوە لە نیعمەتەکانی خوا و، سوپاس و ستایشێکی زۆری بکەی و، گەلێك شوکرانە بژێری بی ؛چونکە ئەوە ڕێگەی زیادکردنی نیعمەتان و فرەوان کردنی بەخششەکانی خوای گەورەیە : ((**لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ** – ئەگەر سوپاس کەن ، نیعمەتتان بۆ زیاد دەکەم )) **ابراهيم** (٧)، ئەوەندە بەسە کە تۆ لەو کاتەدا کە خەریکی ژماردنی نیعمەتەکان و سوپاس و ستایشی خاوەنەکەیانی، هەست بە بەختیاریی و ئاسوودەییەکی زۆر دەکەی و، تام و چێژ لەو نیعمەتە گەورانەی خوا دەکەی . کەواتە: سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو نیعمەتێکی ورد و درشت، چووك و گەورە، کۆن و نوێ ، ئاشکراو پەنهان .

## ناوی بێزارکەران لە دڵی خۆت قەدەغە بکە

لە ژیانمدا ڕێبازێکی جوانم دۆزیوەتەوە کە قورئان باسی کردوە ؛ ئەویش بریتیە لە لێبوردنی جوان و، ڕوو وەرگێڕان لە نەزانان ؛ قەت لەگەڵ ئاژاوەگێران و ئەهلی فیتنە و دوژمنایەتیی مەچۆ نێو گفتوگۆ ومشتومڕ و کێشە ، دەنا ئایین و دڵ و تەندروستیی و هۆش و بیرو ئاسوودەییت لەدەست دەدەی . هەتا بێزارکەرێکت دیت، یان ناسیت، دەمو دەست ناوەکەی لەبیری خۆت وەدەرنێ و، سەرلەنوێ ژیانت دەست پێ بکە :((**وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الجَاهِلُونَ**

**قَالُوا سَلَاماً** – ئەگەر نەزانانیش قسەیان دەگەڵ کردن، پێیان دەڵێن: ( بەرێ خۆتاندا بڕۆن و ) خوا حافیز ))

**الفرقان** ( ٦٣ )،خۆت بە بیرلێکرنەوەیان و ڕیزکردنی خراپەکانیان و بەرپەرچدانەوەیان سەرقاڵ مەکە ، بەڵکو وابزانە ئەو کەسانە هەر دروست نەکراون، وەکو موتەنەبی دەڵێ :

**ویحتقر الحُسَّادَ عن ذکره لهم        کأنهمُ في الخلق ما خُلقوا بعدُ**

ناویان ناهێنێ؛حەسوودەکانی هێندە پێ کەمن        پێی وایە هەر نین لەم دنیایەدا وەك دروست نەبووبن .

جا وەکو چۆن ئەو ژمارانەی بێزارت دەکەن ، لەنێو مۆبایلەکەت دەیانسڕیەوە ، دەبێ ئەو ناوە بێزارکەرانەش ڕەشکەیەوە بۆ ئەوەی خەیاڵت ئاسوودە بێ و، دڵخۆش و تەندروست بژی . تۆ لە سەرت نییە بەرپەرچی هەموو گێل و نەزان و حەسوود و ناحەزێکی دەستدرێژیکار بدەیەوە ؛چونکە ئەگەر وەڵامی شیعرێکت دایەوە ، چاوەڕوانی دە شیعری داشۆرین و تفت و تاڵ بکە و ، ئەگەر وەڵامی وشەیەکی نەفامێکت دایەوە ، سەد وشەی پیسی خراپت بەسەردا دەبارێنێ . بە ئاشتیی پاشەکشە بکە و، بە هێمنیی درێژە بە ژیانت بدە و، دەگەڵ ئەو دوژمنانەی ئیش و کاریان تەنها ناوزڕاندن و بریندارکردن و بەدناوکردنی بەندەکانی خوا و، ئاشکراکردنی هەڵە گەلی خەڵك و دەرخستنی عەیبەکانیان و، تۆڵەلێکردنەوە و ڕق پێ ڕشتنیانە، تێك هەڵمەچوو .

## دوو ڕۆژی جیاواز لە ژیانم

دوو ڕۆژم لە ژیانمدا تاقیکردوونەتەوە ، تا ئێستاش لەبیرم ناچن ؛ ڕۆژێك کە لەدوای نوێژی بەیانی دانیشتووم زیکری خوام کردووە و، لەبەری پاڕاومەوە و، هەتا ڕۆژ هەڵاتوە زکرەکانی بەیانیانم کردوون و قورئانم خوێندوە، پاشان دوو ڕکاتم نوێژ کردوە و، دوای ئەوە چوومەتە سەر ئیش و کارەکانم ، ئیدی ئەو ڕۆژەم سەرانسەر بۆتە خۆشیی و شادیی و سەرکەوتن و باشترین بەرهەم و ئەنجام ، ئەو ڕۆژە بەو پەڕی دڵخۆشیی و بەختەوەریی ژیاوم و، فەرمایشی پێغەمبەرم **(صلی الله علیه وسلم)** وە بیرهاتۆتەوە، کە دەفەرموێ :(( **اللَّهُمَّ بارك لأُمتي في بکورها**– خوایە خێر وبەرەکەت بخە سەرلەسپەیدانی نەتەوەکەم )) **رواه أبوداود والترمذي** ( ١٢١٢ ).

هەستیشم کردوە ئەمن هەر لەسەرەتای ڕۆژەوە شێلگیرانە کلیلی سەرکەوتنم بەدەستەوە گرتوە و ، هاوکاریم لە خوا خواستوە و، خۆم بە زکرە شەرعییەکان پاراستوە و، ئامرازی خەباتم لەم ژیانەدا کەوتۆتە دەست و، لە خوای باڵا دەستەوە کۆمەك و پشتگیریی نەبڕاوەم وەدەست کەوتوە . ڕۆژێکی دیکەش کە لەبیرم ناچێت ، ئەو ڕۆژەیە کە ماندوو و مجرۆ و کەلەلا  لەمزگەوت گەڕامەوە و، یەکسەر دوای بەیانی نوستم و، لەبەر ئەوەی شەوێ نەنوستبووم ، زکر و قورئان خوێندنم دواخست ، چێشتەنگاوێ، تەنبەڵ و تەپ و خەفەتاویی هەستام و، ئەوێ ڕۆژێ هەموو مەوعیدەکانم لەسەر کەڵەکە بوون ، قەت لەبیرم ناچێ چۆن دڵم پەرت و بڵاو بوو و، تەبیعەتم تێکچوو و،

مەوعیدەکانم شێوان و، بە نیگەرانیی و شەپرێویی و و بێزاریی ، دەست و پێی خۆم ونکرد و ، مەوعیدی یەکەمم دەبردە جێی دووەم و دووەمم دەبردە جێی سێیەم و سێیەمیش جێی چوارەم ! هۆیەکەشی ئەوە بوو کە دەستپێکردنی ڕۆژەکەم هەڵە بوو و،دەگەڵ بەرەکەتی بەرەبەیان و ڕێوشوێنی پێغەمبەر(**صلى الله عليه وسلم**) نە دەگونجا و بە زکرو دوعا و پاڕانەوە دەستم پێنەکرد. هەڵبەت ئەو دوو ڕۆژانە نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە ! جا براکەم، پەند وەربگرە و ڕۆژی نوێت بە زکری خوای مەزن و، داوای باراندنی ڕەحمەت و بەرەکەتی پەروەردگاری زەویی و ئاسمان و، ناردنی بەزەیی لە زاتێکەوە کە لە هەموو کەس بە بەزەییترە ، دەست پێ بکە ،دڵخۆش و شادمان و بەختەوەر دەژی .

## لە وریا کەرەوەکان و شەونخوونی بێ سوودی دوور و درێژ دوورکەوە

چەند برادەرێکم داوایان لێ کردم لە ئۆردووگایەکی دەرەوەی شار پێکەوە دابنیشین ؛ ئاگریان کردەوە و قاوە و چایان لەسەر پۆلووان لێنا و، لەگەڵ قسە و باس و شیعر خوێندنەوە ، دەستمان بە چا و قاوە خواردنەوە کرد ، تا بەشێکی زۆری شەوێ تێپەڕی . کە چوومەوە ماڵێ ویستم بنووم ، هەرچەندی کردم ، نەمتوانی ، تا بەیانی نیگەران و بێ خەو لە جێدا مامەوە و، ڕۆژەکەم هەمووی شێوا و خەم و خەفەت دایگرتم، ئەمەش هەمووی لەبەر ئەو وریا کەرەوانەی هەندێك جار دەگەڵ برادەران زۆریان لێ دەخوێنەوە و، گوێ نادەینە کاتەکانی نوستن و پشووی لەش و ئاسوودەیی دڵ و دەروون و بیرمان. کەواتە .. ئاگاداربە ، زۆربەی پزیشکان باسی زیانەکانی ئەو ماددانەیان بۆ لەش و عەقڵ و ڕووح کردووە و ، هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی و ، کاتی نوستن و کاتی بێداریت ڕێك خە ، بە ئاسوودەیی دەژی . هەر وەکو (**ابن الجوزي**) یش دەڵێ: بەڕاستی لەش بۆ گیان، وڵاخی سوارییە ، بۆیە پێویستە ئاگامان لەلەشمان بێت و بیپارێزین ، تا سەرەنجام بمانگەیەنێتە دەریای سۆز و بەزەیی خوای میهرەبان و بەهەشتی نەبڕاوەی . کەواتە: لە شتی حەڵاڵ و ڕێ پێدراویش ، قەت زێدەڕۆیی مەکە و ، هەمیشە پوخت و ڕێك و پێك بە ، بۆ ئەوەی بە چاکی ئەرکی خۆت لە ژیاندا بەجێ بێنی و ، بە ئاسانیی بگەیە هەواری سەرکەوتن و بەختەوەریی .

## ماڵ پەرستی بیرو هۆش تێکدەدات

پزیشکێکی سعوودیی لە ڕیاز پێی گوتم : بازرگانێکی بەناوبانگ هاتە لام هەندێك زیپکەی لە لەش هاتبوون ، پزیشکەکە پێی گوتبوو: دەبێ سێ مانگ لە ڕیاز بمێنیەوە بۆ ئەوەی چارەی ئەو نە خۆشییەی پێستت بۆ بکرێ .

بازگانەکەش پێ گوتبوو : ناتوانم لە ڕیاز بمێنمەوە ؛ چونکە چەندان مەوعید و سەفەری بازرگانیم لە دەرەوەی سعوودیە هەن . پزیشکەکە پێی گوتبوو : باشە ، ئەتوو دارا و دەوڵەمەند نی ؟! ناتوانی ئەو مەوعید و سەفەرانە

لەبەر خاتری تەندروستی خۆت دوا بخەی ؟! بازرگانەکە گوتبووی باوەڕم پێبکە ، سێ ملیار ڕیاڵم لە بانکە ، ئەوە بێجگە لە زەویی و زار و خانوو و باخچە و ئەو شتانە و ، ڕەچەڵەك و منداڵیشم کەمن . پزیشکەکە پێی گوتبوو : ئەوە بۆ ساڵە های ساڵ بەشی خۆت و منداڵ و نەوەکانت دەکات . گوتی: ڕاستە، بەڵام باسی ئەوەم بۆ مەکە ؛چونکە من تووشی نە خۆشیی ماڵ و سامان کۆکردنەوە بووم ، پرۆژەیەك تەواو کەم ، دەچمە سەر پرۆژەیەکی دیکە و ، لەسەودا و مامەڵەیەك ببمەوە ، یەکی دی دەست پێدەکەم ، تەنانەت ماڵ و خێزانیشم زۆر لەماڵێ نامبینن ؛ چونکە بەردەوام بە وشکانیی و هەوادا لەسەفەرم و ، لەدەرەوە و ناوەوە سەرقاڵی ئیش و کارەکانمم .

دکتۆرەکە دەیگوت: بەخوا ، سەرم لەو ژیانە پەرت و بێسەرو بەرەی سوڕمابوو ، کە خاوەنەکەی ، بەو هەموو دەوڵەمەندییەی، کاتی نییە چارەسەری خۆی بکات و ، بە ئاسوودەیی لە نێو ماڵ و خێزانی خۆی دانیشێت و، تەماشای منداڵەکانی بکات و،چێژ لەو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیون ، وەرگرێت ! جا داوات لێ دەکەم بەدوای درۆی سامان کۆکردنەوە و، ماڵ پەرەستیی مەکەوە ، سامان خزمەتکارێکی چاك و گەورەیەکی خراپە ، بۆیە وابکە سامانەکەت خزمەتت بکات و هەر لە گیرفانت دابێت، نەك لە دڵتدا و، ئاوڕ لە ئایین و تەندروستی و ماڵ و خێزانت بدەوە و، کاتت لە ماڵ  وەسەرێك نان سەرف مەکە؛ دەنا تەندروستیی و ئاسوودەیی و ئارامیی و، چێژی ژیانی نێو ماڵ و خێزانت لە کیس دەچێت ؛ وەکو گوتوویانە : لەگەنجیماندا تەندروستیی خۆمان لە سەر کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دانا ، پاشان لە پیریدا ماڵ و سامانەکەمان لەگەڕان بەدوای تەندروستیدا دانا !

## شانازیی بە ئیسلامەوە بکەن؛چونکە پیرۆزترین تاجی ژیانە

لەگەڵ چەند برادەرێکم سەردانی ویلایەتی ( کوجڕات) مان کرد لە هیندستان کە ویلایەتی ( غاندی )یە .

زۆر بە گەرم و گوڕیی پێشوازییان لێ کردین ؛چونکە لە وڵاتی مەککە و مەدینەڕا هاتبووین و، بۆ بەخێر هێنان گەورە و بچووکیان لێمان کۆبوونەوە ، فەت لەبیرم ناچێ چەند زانایەکی لە ئێمە بەتەمەنتر و زاناتر و بەڕێزتر، پێش نان خواردن ئاویان لەدەست کردین ! ئاهەنگی وتارخوێندنەوە بۆ بەخێرهاتنمان دەستی پێکرد ، وتاربێژێکیان کە لەهەموو وتاربێژەکانیان زمان ڕاونتر بوو ، هەستا ، هەڵبەت هەرچۆنێك بێ بۆ وان ئاساییە ؛ چونکە زمانی عەرەبی بۆ وان قورسە ، وتاربێژ دەستی پێکرد، بەخێرهاتنی دەکردین و هەوڵی دەدا جوانترین دەربڕین هەڵبژێرێ ، دەیگوت ((**زارنا ألماء إزام من الهرمين شرذمة قليلون**)). وایزانی بە بەکار هێنانی (( **شرذمة قليلون** )) ، چونکە لە قوڕئاندا هاتوە ، ڕێزی لێ گرتووین؛ کە ئەوە دەربڕینێکە ، فیرعەون وەك جنێوێك بە مووسا و بەو بڕوادارانەی گوت ، کە دەگەڵی بوون . ((**شرذمة قليلون**))یش واتای دز و چەتەو ڕێگر و شتی وا دەگرێتەوە .... لەبەر خۆماندووکردنی لە بەخێرهاتنمان و، هەوڵدانی بۆ هەڵبژاردنی وشە و بە هەڵەچوونی لەمەبەستی دەربڕینەکە ، دەستمان بە پێکەنین کرد و لێمان نەگرتن . مەبەستم ئەوەیە کە بەهۆی ئەم دینە گەورەمان کە

ئیسلامەو خوای پەروەردگارمان پێی سەربەرز کردووین ، ئاوا پێشوازییان کردین و، نەیان پرسی ئێمە لە چ ڕەچەڵەك و هۆز و بنەماڵەیەکین و، هیچ گوێیان بەو شتانە نەدا و، ئەگەر ڕەچەڵەکەدار ( **شجرة أنساب** ) یێکی دووورودرێژمان پێبا ، لە مەککەوە تا ( نیودلهی ) درێژبا ، سەرنجی ڕانەدەکێشان ، بەڵکو قسە و باسیان لە کۆڕ و مەجلیسەکانیان هەر ئەوە بوو کە ئێمە لە وڵاتی دوو حەرەمەکەوە هاتووین و، خەڵکی ئەو وڵاتەین خوا لەوێ جبریلی بە ڕێنومایی و ئاینی ڕاستەوە ناردۆتە لای پێغەمبەرمان (**صلى الله عليه وسلم**) موحەممەدی گەورەی مرۆڤایەتی تێدا بۆتە پێغەمبەر . کەواتە : بە ئیسلام سەربەرزین و، سوپاسی خوا بکەن کە کردوونی بە مسوڵمان و، ئەو سەربەرزییە بە بانگەواز کردن بۆ خوا بە لێزانیی و ئامۆژگاریی چاکە ، بخەنە کار .

## پاك و خاوێنیی و بۆنخۆشیی ئارامی گیانە

لە عومان ، دوو جار سەردانی مەسقەت ڕەستاقم کرد و ، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کە لە ماڵەکانیاندا زۆر بایەخیان بە عەتر وهەموو جۆرەکانی بۆنی خۆش دەدا ، بە جۆرێك ماڵیان دەتگوت دووکانی عەتر فرۆشانە. پێش خواردن ، هەنگوینیان دەهێنا دەگەڵ هەندێك بۆنی خۆش ، پاشان داری عوود و حەلوای عومانیی ، لە کۆتاییشدا بخوور و گەزۆ و ئەوشتانەیان دادەنان . ئەوەش دەروونت ئاسوودە و دڵت خۆش دەکات و، خەڵکی عومان سەرباری دڵفرەوانیی و بەخشندەیی و میهرەبانی و خۆش مەشرەبیی ، لە نێوخەڵکدا بەوە بەنێوبانگن . جا داوات لێ دەکەم جلك و ماڵ و ترومبێلت بە عەتر و بۆنی خۆش ، با سەرچاوەی ئاسوودەیی و خۆشیی بێت ؛ چونکە خوا جوانە و حەزی لە جوانییە و، پێغەمبەرمان (**صلى الله عليه وسلم**) زۆر حەزی لە بۆنی خۆش بوو و – باب و دایکم بە قوربانی بێ – هەمیشە بە پاك و خاوێنیی و بۆنخۆشیی دەبینرا ، بەڵکوو تەنانەت ئارەقەکەی عەترێك بوو لە میسك بۆنخۆشتر و، کە بەرێدا دەڕۆشت، بۆنی خۆشی لێ دەهات و، ئەگەر تۆقەی دەگەڵ کەسێك کردبا ، تاماوەیەکی زۆر بۆنی خۆش بەدەستی ئەو کەسەوە دەمایەوە ؛ سەلامی خوا لەو کەسەی خوا بە زیندوویی و بە مردوویی ، بە پاکیی و بۆنخۆشی دروستی کردبوو .... لە گیان و دەروونیدا، لە ڕەوشت و ئاکاریدا ،لە بۆنیدا، لە ئارەقیدا ، لە هەناسەکانیدا هەر بە پاکیی دروستی کردبوو . لە خوام داوایە بیکاتە تکا کارمان و، لە دنیا و دواڕۆژدا ڕەگەڵ پاکانمان بدات .

## چاکە کردن دڵخۆشت دەکات

لەو ساتانەی بە حەیاتم لەبیرم ناچن و، دڵم ڕادەچڵەکێنن و فرمێسکم دەبارێنن ، ئەو ساتانە بوون کە سەردانی هەتیوخانەم دەکرد و، دەستم بەسەری هەتیواندا دەهێنا و ، گوێم لە قسەکانیان و بەسەرهاتی داهێنانەکانیان دەگرت و، گەورەترین هەتیوی جیهانم دەهاتەوە یاد: پێغەمبەرمان (**صلى الله عليه وسلم**)و؛ هەرجارێك لەگەڵ

کۆمەڵەکانی خێر خوازیی و چاکەکاریی و سەرپەرشتیی هەتیوان و هەژاران و نەداران ، سەردانی ئەو شوێنانەم دەکرد، دڵم نەرم دەبوو وڕادەچڵەکی و، هەستم بە ئاسوودەیی و دڵنیایی دەکرد و، متمانە و گەشبینیم دەرهەق ڕەحمەتی بە ڕەحمترین کەس زیادی دەکرد ؛ چونکە لە پرۆژەیەك بەشداریم دەکرد کە خوا مەدحی کردوە و پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) یش لەبارەیەوە دەفەرموێ: ((**أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا** – ئەمن و سەرپەرشتی هەتیو ئاواین )) **رواه البخاري** (٣٦٥ ) . ئاماژەی بۆ قامکی شەهادە و نێوە ڕاستی کرد و، تۆزێکی لێك جیاکردنەوە . جا داوات لێدەکەم ڕۆژی کاتێك ، یان: حەفتەی کاتێك ،یان مانگی کاتێك بۆ یارمەتی و بەسەر ڕاگەیشتنی ئەو هەتیوو هەژارانە تەرخان بکەی ، بەو کارە بەرەکەت دەکەوێتە ڕزق و ماڵ و ڕەچەڵەك و ماڵ و منداڵت ، خوا لە دنیا و دوارۆژدا بەختەوەرت کات .

## خەڵك بە گەورە بزانە بە گەورەت دەزانن و ڕێزیان بگرە ڕێزت دەگرن

پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وسلم**) فێری کردووین پلە و پایەی خەڵك بزانین؛ ڕێزی مسوڵمانی بەساڵداچوو و، زانای کە ئیش بە زانستەکەی دەکات و، ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە و، نە زێدەڕۆیی تێدا دەکات، نەکەمتەرخەمیی ، بگرین . من لە ژیاندا تاقیم کردۆتەوە، ڕێزی خەڵك بگری و بە گەورەیان بزانی ، ڕێز و حورمەتت دەگرن و بە گەورەت دەزانن ، ئەوە سەرباری پاداشتی خوای گەورە و خۆشەویستیی خەڵك و ستایش و دوعای خێریان ؛ کەواتە : پلە و پایەی هەموو کەس بزانە ؛ ئەگەر تووشی کەسێکی بەتەمەن بووی ، سەری ماچ کە و بە بابی ، یان دایکی فڵان بانگی کە و، لە باس و خواسی بپرسە، لەگەڵی میهرەبان بە ، ئەگەر زانایەکت دیت، لەگەڵی بێ فیزبە و لەقەدەر خۆی ڕێز و حورمەتی بگرە ، ئەگەر قورئان لەبەرێکت بینی، ئەو قورئانەی لەسنگیدایە ، بەگەورە بزانە و، بەهۆی قورئانە ئەو پەڕی حورمەتی بگرە ، ئەگەر بەلای نەدارێك، هەژارێك ، هەتیوێکدا ڕەتبووی ، خاکە ڕایی و سادەیی بنوێنە و، دەگەڵی بەسۆز و دڵنەرم و میهرەبان بە ؛ چونکە بەو کارە سوپاس و پێزانینی دنیا و پاداشتی دوارۆژت وەدەست دەکەوێت . نەفس بەرزیی و گەورەیی لێرە دەردەکەوێ ، ڕەسەنایەتیی و مرۆڤایەتیی و جوامێریی ، لێرە دیاریی دەدات ؛ نموونە بەرز و بەها باڵاکانیش هەر لێرە ئاشکرا دەبن.

کەواتە : بۆ ئەو کارە مەزنانە دەست پێشخەری بکە و، هەوڵ بدە هەموو دەرفەتێك بۆ بەختەوەریی خەڵك بقۆزیەوە، خوا لە دنیا و دوارۆژدا بەختەوەرت دەکات .

## بەختەوەریی ئەوەیە ئەوەیە خۆت لە شتێك هەڵنەقورتێنی،کە پەیوەندیی بە تۆوە نییە و، بەو کارە خەیاڵت ئاسوودە و خۆت بەختەوەر دەکەی

له حەجێ، لە ئۆردووگای نوور، پیاوێکی خەڵکی پارێزگای ( خەرج)ی باشووری ڕیازم دەگەڵ بوو ، لە ژیانمدا کەسم نەدیبوو لەوی بەختەوەرتر و دڵخۆشتر و بەڕەوشتتر، تەمەنیشی لە حەفتا ساڵ هەتڵە بوو بوو . دەربارەی ژیانی پرسیارم لێکرد ، گوتی : دەستم بەم فەرموودەی پێغەمبەرەوە **(صلى الله عليه وسلم)** گرتوە ((**من حُسن إسلام المرء تركه ما لا يعنيه** – بەشێك لە چاکیی ئیسلامەتیی مرۆڤ ئەوەیە، خۆ لە شتێك هەڵنەقورتێنێت کە پەیوەندیی پێوە نییە )) **رواه الترمذي** ( ٢٣١٨ ) . ئەمن لە نێو کێڵگەکەم دەژیم و بەشداریی دەعوەت و بۆنەکان ناکەم ؛ پێش بەرەبەیان هەڵدەستم و وەترەکەم دەکەم و، چاوەڕوانی بانگی بەیانی دەکەم ،کە بانگی دا ، نوێژی بەیانی دەکەم و، لە نوێژگەکەم چاوەڕێ دەبم تا تاو هەڵدێت ، دوای ئەوە دوو ڕکات نوێژ دەکەم و، لە کێڵگەکەم دەچمە نێو مەڕی و، هەندێك جار بۆخۆم دەگەڵ ژنەکەم خواردن ئامادە دەکەم و، کە خورما پێ گەیشت ، لێی دەکەمەوە ، بۆخۆم دروێنە دەکەم و، کاتێکیشم بۆچوونە خزمەت قوڕئان تەرخان کردوە ... هەر خوا دەزانێ چەندە ئاسوودە و بەختەوەر و ئارام بووم ، ئەوە بۆ من بوو بە پەند و عیبرەت و، دینەکەی پارازتم ؛چونکە ئەمن جاران بە گەنجیی ، دڵڕاگریی ( **مجاملة**)ی خەڵکم دەکرد و ، دڵنەواییم دەکردن و، بەشداریی بووك و بۆنە و دەعوەتانم دەکرد و، گوێم لە چەندان قسە و قسەڵۆك و غەیبەت و تیرو توانج دەبوو و، تووشی کات بە فیڕۆدان و نیگەرانیی و بیربلاویی و دەبووم ، پاشان پەروەردگاری بەرز و بالاّم ڕێنومایی کردم ، دوای ئەوەی لە نێو کێڵگەکەم لەدەرەوەی شار، خانوێکی تازەم دروستکرد .... کە دەگەڵ خۆم و ماڵ و خێزان و کێڵگەکەم وەمێنم و، خەریکی کار و باری تایبەتی خۆم بم ، ئەوکاتە وەکو سەرلەنوێ لە دایك ببمەوە، وابوو . بەڕاستیی ، کاتێك باسی بەختەوەریی دەکەم ، وێنەی ئەو پیاوەم هەر لەبەر چاوە ، کە ژانیویەتی ئاسوودە و ئارام بژیت. زۆربەی خەڵکی ئەم سەردەمە بەو شتانەی کە پەیوەندییان بەوانەوە نییە ، سەر قاڵن و، خۆیان دەخەنە نێو گێژاوی کێشە و مشتو مڕ و قسەو قسەڵۆك و، دەچنە ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەی هیچ پێوەندییان بەوانەوە نییە و، چ ڕۆڵێکیان تێدا نین و، بە هەر بۆنەیەك بزانن ، بۆی دەچن و، کاتی خۆیان تێدا بەفیڕۆدەدەن و، بەرژەوەندیی خۆیان تێیدا دەفۆتێنن و، گوناحی خۆیان تێیدا زیاد دەکەن و، خوا دەزانێ چەندە شتی ناخۆش و قسە و قسەڵۆك و غەیبەت و دووزمانی تێدا دەبیسن ! جا داوات لێ دەکەم ڕوو لە کارو باری خۆت بکەی و، بەکاری خۆتەوە خەریك بی و ، هەوڵ و بایەخت لەسەر سەرکەوتنەکانی خۆتدا چڕ کەیەوە ؛ چونکە کەس بیر لە مەرگی من و تۆ ناکاتەوە و، کەس دەگەڵمان نایەتە نێو قەبری و، کەس لە جیاتی تۆ لێپرسینەوەی دەگەڵ ناکرێ ، لە دنیا و دوارۆژدا تۆ لە خۆت بەرپرسی ؛ کەواتە : ڕووحی خۆت قوتارکە و، کاتی خۆت بپارێزە و بە فیڕۆی مەدە و، ڕوو لە خوا کە ، بەختەوەر و سەرکەتوو دەبی .

## گۆشەگیر دەبووم تا سەلامەت بم و بزانم و تێبگەم و بەئامانج بگەم و چێژ وەربگرم

ئەم دەربڕینەم لە کتێبێکی د. علی سەللابیی بەناوی (( **سيرة العالم الليبي** ، عبدالجبار السردی – ژیاننامەی زانای لیبیایی، عەبدولجەبار سەردیی)) خوێندەوە، زۆر دڵخۆش و سەرسامی کردم؛ ئەو زانایە گۆشە گیر بووە تا لە

گوناحان وكێشە لەگەڵ خەڵك  دوور و سەلامەت بێت ، بەڵام سەرباری سەلامەتیی، سوودیشی لە كاتی وەرگرتوە و فێریش بووە ، پاشان ئەوەی فێری بووە،  تێی گەیشتوە ، دوایی سوود وەرگرتن لە تەمەن و ئاسوودەیی وەدەست كەتوە ، دوای ئەوە لەتەنیاییەدا چێژی لەو نیعمەتانەی خوا وەرگرتوە . ئەمنیش پێم وایە دەبێ چەند كاتێكت هەبێ تێیاندا دەگەڵ قورئانەكەت و كتێبەكانت و ئارامیی خۆتدا تەنها بی و ، داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارت بكەی و، مشووری كاروباری ژیانت بخۆی و، بیر لە قیامەتت بكەیەوە .... بەڵام ئەگەر لەنێو دەنگە دەنگی ژیان دانیشی و تێكەڵاوی هەموو كەس بی و، ڕەگەڵ هەموو خەڵكی بكەوی ، ئەوە خوا ڕەحم بە دڵ و دین و كات و تەنانەت سەرپاكی ژیانت بكات . هەوڵدە كاتێكت هەبێت بۆ پشوودان و ، كاتێك بۆ بەخۆداچوونەوە و، كاتێك بۆ لێپرسینەوە و چاودێریی خۆت ؛ چونكە ئەو كاتانە بە شێوەیەكی بەرچاو ژیانت ڕێك دەخەن و، سەرەنجام كاری دنیا و دواڕۆژت ڕاستە ڕێ دەبێت و، ماف و ئەركی خۆت دەزانی .

## ژیان بیر و باوەڕ و تێكۆشانە

پازدە ساڵ پێش ئێستا لە دەورووبەری **(حفر الباطن)** لەگەڵ برادەرێك سەردانی ( عوسمان مازیی )ی بازرگانمان كرد – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – كابرایەكی زۆر خواپێداو و دەوڵەمەند و، خاوەنی زەوی و زارێكی زۆر و چەندەها خانوو بوو ، بۆی گێڕاینەوە چۆن لە سەردەمی گەنجیدا هیچی نەبووە و، بە دوای كارو كاسپیدا گەڕاوە ؛ دەیگوت : جەڵەب كڕبووم و بۆ كڕین و فرۆشتنی مەڕان، بە پێیان لە **(حفر الباطن)**ەوە دەچوومە ( كوێت )، هەر لە بیرمە كە چەندان جار، لەڕێ  باران كڕیوەی دەكرد و، بای بەهێزی دەهات و هەتا بڵێی سەرما بوو، بە پێخواسیی جلەكانم هەمووی بە لەشمەوە دەنووسان و، بە خۆ و بە جڵەبە مەڕەوە خەریك دەبوو ڕەق ببینەوە و هیوام بە ژیان نەمابوو و، لەسەرمان لەبەر ئەو با بەهێزە هەڵدەلەرزیم ، پاشان سوپاس بۆ خوا، ڕزق و ڕۆزیی بەسەردا باراندم و، ساغیی و تەندروستیی و ماڵ و منداڵی پێ بەخشیم . ئەو پیاوە ، عوسمان مازیی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ - لە مینای حەج ناسیم ؛ پیاوێكی زۆر لەسەرخۆ و خواپەرست و دەم بە زكر و دڵخۆش بوو : لەو نیعمەتی ماڵ و سامانەی خوا پێی دابوو ، زۆر بەخشندە و دەست كراوە و بە خێر و خێرات بوو . جا پێت وانەبێ سەركەوتن بە خۆڕایی دەست دەكەوێت و، گەیشتنە لووتكە  ئاسانە و هێندەی ناوێ ؛  هەموو سەركەوتنێكی دنیا و دین، لە دوای هەوڵ و تێكۆشان و ئازایەتیی و قوربانیدان و ئارەق ڕژتن و كوێرەوەریی دەست دەكەوێت؛ ئەوە دەستووری خوایە لە ژیاندا. كەواتە : هەوڵدە و ئارام بگرە و چاوت لە پاداشتی خوا بێ و كۆڵ مەدە ، پشت بەخوا بە ئامانج دەگەی .

## بەسەرهاتی من دەگەڵ دەنگوباس

لەسەرەتای تەمەنمدا ، لەبەردەم شاشەی تەلەفزیۆن دادەنیشتم تەماشای دەنگوباسم دەکرد ، تاکو بزانم چ باسە و ڕەوشی مسوڵمانان چۆنە ، لە هەواڵنامەیەکەوە دەچوومە هەواڵنامەیەکی دیکە و، لە شیکردنەوەیەکی سیاسییەوە ، بۆ دووەم و سێیەم و بەو جۆرە... بەرردەوام بەدوای هەواڵی شەڕ و کوشتار و وێرانکاریی و تەقینەوە و دەربەدەرکردن و ، ئەو هەواڵە ناخۆشاندا دەگەڕام هەواڵنامەکان پێداگرییان لەسەر دەکەن ؛ چونکە بەزۆریی ئەوانە ناچن هەواڵی خۆش بڵاوبکەنەوە ؛وکو: هەرزان بوونی شمەك و زۆربوونی ڕۆزیی و نیعمەت و خێر و خۆشیی و ، تەندروستی و ئاسودەیی و ئارامیی و پاشەڕۆژی ڕوون و سەرکەوتنی گەورە و پێشبینیی خۆش ؛ بەڵکو ڕێژنەی هەواڵی ناخۆشی وەکو: شەڕی قورس لەفلاَن ولاَت و، کوودەتا لەولاَتێکی دیکە و ، بەربوونەوەی فڕۆکەیەك و ، تەقاندنەوەی بینایەك و ، هەڵتەکاندنی کۆشکێك و ، سوتاندنی ترومبێلێك و وەرگەڕانی شەمەندەفەرێك و...... تاکۆتایی ئەو لیستە هەژێنەرە تۆقێنەرە ترسناکەت بەسەردا دەبارێنن.

پاشان دوای چەندان ساڵ هاتمەوە سەرخۆ و ، بۆم دەرکەوت کار وا بڕوات ، وردە وردە مێشکم وێران دەبێت ؛ چونکە من هەرچی بارگەی هەواڵە ناخۆش و ترسناکەکانە ، لەبیرمدا کۆیان دەکەمەوە و لەدڵمدا دەبنە خەم و خەفەت و داخ و کەسەر و ئاخ و ئۆف ؛ لەبەر ئەوە چوومە سەرکارو بار و بەرنامە و چالاکیی زانستیی و مەیدانیی خۆم و ، چیدی گوێم نەدایە هەواڵەکان ؛ چونکە لەدوعا بەدەر بۆ برا مسوڵمانەکانم هیچم پێ نەدەکرا و، تووشی نیگەرانیی و بێزاریش دەبووم و، ئاسوودەییشم لەدەست دەچوو. جا کەوازم لەدەنگوباس و شرۆڤەی سیاسیی هەواڵاَن هێنا ، ئاسوودە و دڵنیا بووم و گەیشتمە کەناری شادیی و ئارامیی. لەپێشدا وام دەزانی ئەمن بۆخۆم ئەو بیردۆزەم دۆزیوەتەوە ... بەڵاَم تەماشام کرد نووسەرێکی ئەمریکی لەنامیلکەیەکدا بەناوی (پەنجا دەستووری سادەی بەختەوەریی)، پێداگریی لەسەر هەمان ئەم بابەتە دەکات و، داوات لێ دەکات عەقڵ و هۆش و ئاسوودەیی و ڕووحی خۆت لە بەدواداچوونی هەواڵگەلی ناخۆش و بێزارکەر، کە لە ئاژانسەکانی دەنگوباس و کەناڵە ئاسمانیەکانەوە بڵاودەبنەوە ، بپارێزی.

## گەنجێك لەلێواری داڕووخان وخۆکوشتندا

لە فڕۆکەکەدا لەتەنیشتم سواربوو ، گەنجێك بوو خەمۆکیی و پەشێویی پێوە دیاربوو ، قسەم دەگەڵ دەکرد ، دیتم ئەوەندە شپرزە و نیگەرانە ، لە ژیان بێزار و لە دنیا نائومێد بووە ؛ لێم پرسی : نوێژان دەکەی ؟ گوتی : نوێژان هەرناکەم ، ئیدی دەستم بە باسکردنی سوود و چاکەی نوێژ کرد ، کە ئاسوودەیی گیان و کۆمەکی خوایە و، بەرهەمی بەکەڵکی بۆ مرۆڤ هەیە ، باسی چەندان نموونە و بەڵگە و ژیانی پیاوچاکانم بۆ کرد و، چەندەها ئایەت و حەدیسم بۆ هێنانەوە ، گەشتەکەمان درێژ بوو ، بەڵێنی دامێ لەسەر نوێژ بەردەوام بێت ، لەوای چەند مانگێك

پێوەندیی پێوەکردم و هەواڵی دامێ کە لەوپەڕی بەختیاریدایە و، زۆر شادمان و دڵ کراوەیە و، لەسەر نوێژەکانی بەردەوامە و، ڕۆژانە یادی خوا دەکات و قورئان دەخوێنێت . سوپاسی خوای گەورەم کرد و زانیم نوێژ بناغەی ڕزگارکردن و بەلەمی ڕزگاریی مرۆڤ و پردی نێوان بەندەی لاوازی کەمتەرخەمی لاڕێی بێ ئاگا و خوای تاك و تەنهای بێنیازی بەخشندەیە و هەرکەسێك واز لەنوێژبێنێت ، ئەوە حوکمی هەرەس و وێرانبوون و خۆکوشتن و تورەیی خوای بەسەرخۆیدا داوە. لەبەر ئەوە پێویستە بەملکەچیی نوێژەکانمان بکەین و ، ئاگامان لە کات و ڕێوشوێنەکانیان بێت ، بۆ ئەوەی لەهەردووك دنیا بەختەوەربین. خوای گەورە دەفەرموێ : (( **واستعينوا بالصبر والصلاة وإنها لكبيرة إلاّ على الخاشعين – یارمەتیی لەسەبرو نوێژ بخوازن ، چونکە بێگومان - نوێژ – لەسەر ملکەچانی خوا نەبێت ، قورسە** )) (البقرة - ٤٥ - ). ژیان بە نوێژەوە چەند جوانە ! ئەو خولەکانە چەند گەش و درەوشاوەن کە بە کڕنووشبردنەوە لە دوعا و پاڕانەوە لەگەڵ خوادا بەسەریان دەبەین ! کەواتە: ڕوو بکە نوێژەکەت، سەرکەوتوو و بەختەوەردەبی، چونکە نوێژ یەکەم کلیلی سەرکەوتنە.

## ئامۆژگاریی منت لەیاد نەچێت!

سێ ئامۆژگارییانت دەکەم : (( گوێ مەدەیە دەژی ، نیعمەتان وەبیرخۆت بێنەوە دەبووژێیەوە ، بیر لەگەردوون بکەوە سەرسام دەبی )) .

یەکەم – گوێ مەدەیە دەژی ، خۆت لە قسەی گەمژە و ڕەخنەی حەسوودان و تیروتوانجی نەزانان گێل کە و چاوت لە بەرەکەتی خوا بێ و بجووڵێ و ، خۆت بە کێشە و ناکۆکیی خەڵکی بێ ئیش و هیچ خەریك مە کە و، هەر خۆت لەسەرە و خەریکی خۆت بە و ، ئەوەی پێوەندیی بەتۆوە نییە ، خۆی تێ هەڵمەقورتێنە ؛ چونکە ڕەخنەی هیچ و بێ نرخ نیشانەی سەرکەوتنەکانی تۆیە و ، ئەگەر کارێکی گەورەت نەکردبا و ، خاوەنی پرۆژە و بەرهەمێکی گەورە نەبای ، ڕەخنەیان لێ نەدەگرتی ؛ کەواتە: خۆ گێل کەو گوێ مەدەیە ، قسەو قسەلۆکیان دەبێتە تۆزی بەر با.

دووەم – وەبیرهێنانەوەی نیعمەتان و سوپاسکردنی خوای گەورە لەسەریان و ، چێژ وەرگرتن لەم کارە ، دەبێتە هۆی کرانەوەی دڵ و دەروون و ، ئاسوودەبوونی خەیاڵ و بەهێزبوونی لەش.

سێیەم – چاوت بکەوە و بیر لە داهێنانی خوای داهێنەری باڵا دەست لەدروستکردنی ئەم گەردووندا بکەوە و، نیشانەکانی یەکتایی خوا لە بوونەوەرەکان و پیتەکانی بێ نیازیی و جێنیازیی خوا لە دروستکراوەکاندا بخوێنەوە و ، چاوبڕە باخچە ڕازاوەکان و کێوەسەرکەشەکان و ، هەورە کەڵەکە بووەکان و ، گرد و سارا پان و پۆڕەکان و ، ڕووبار و دارودرەخت و گوڵ و بەروبووم و ، خوای تاکی باڵا دەست بەپاك بزانە، سەرت لەشاکاری خوا و ، شکۆ و

توانا و ، گەورەیی دروستکراوەکانی بەدیهێنەری باڵا دەست سوڕ دەمێنێ . کەواتە: ئامۆژگاریەکەمت لەبیر نەچێت:

(( گوێ مەدەیە دەژی ، نیعمەتان وەبیرخۆت بێنەوە دەبووژێیەوە ، بیر لە گەردوون بکەوە، سەرسام دەبی )) .

## وەك مێروولە لەهەوڵ و تێکۆشاندا بە ، بەختەوەردەبی

سێ نموونەت لە ژیان بۆ دێنمەوە ، جێبەجێیان کە ، بەختەوەر و سەرکەوتوو و سەرفراز دەبی :

یەکەم – وەك دارخورما سەرکەش بە؛ دارخورما بەرز هەڵچووە و لە ئازار و شتی نەوی بەدوورە ، ئەگەر گەمژەیەك بەردێکی تێگرت ، خورمای نەرمی بەسەردا بەردەداتەوە؛ کەواتە: بە شکۆ و بەرزیی ڕەفتار دەگەڵ خەڵك بکە – بەتایبەتی خەڵکی کەودەن و نەزان – و گوێیان پێ مەدە و ، وەڵامی قسەیان مەدەوە و ، بەشێوازێکی جوان چاو پۆشیان لێ بکە (( وإذا خاطبهم الجاهلون قالوا : سلاماً – ئەگەر نەفامەکان قسەیەکیان پێ گوتن ، دەڵێن : بەڕێی خۆتاندا بڕۆن )) الفرقان -٦٣- . هیچ حیسابیان بۆمەکە ، بەختەوەر دەبی و لەسەر ڕێگەی خۆت بەردەوام دەبی ؛ چونکە مەبەستیان لە نارِەحەت کردنت ئەوەیە ئاوڕیان لێ بدەیەوە و ڕوویان تێکەی و ساردت کەنەوە ، بەڵام وا بکەی ، لە ڕێکردن دەوەستی ؛ کەواتە : پشت بەخوا ببەستە و ، بەرەو پێش بڕۆ و ، ئاوڕ بۆ دواوە مەدەوە.

دووەم – لە هەڵبژاردندا وەك هەنگ بە ؛ چونکە هەنگ دەچێتە دەرێ بۆ باغ و بێستانان و ، گەشترین گوڵ و جوانترین و بەتامترین بەر هەڵدەبژێرێ و ، دەیکاتە هەنگوینێکی پوختی بەکەڵك بۆ خەڵك ، ئەتۆش لە ژیانتدا وەجووڵە کەوە و ، تەنها گوفتار و ڕەفتار و ڕەوشی هەرە چاك هەڵبژێرە و گوێ بەهیچ ئازار و زیان و خراپە یەك مەدە و ، تەنها جوانترین و چاکترین و قسە و کردار پێشکەشی خەڵك بکە، لە خۆیان خۆشتر دەویێ ؛ کەواتە: لەم ژیانەدا لەسەر هەڵبژاردن بەردەوام بە.

سێیەم – وەك مێروولە لە هەوڵ و تێکۆشاندا بە؛ چونکە مێروولە ئەگەر بیەوێ بچێتە سەردارێك ، هەزار جاریش بەربێتەوە ، هەر کۆڵ نادات و، هەوڵەکەی دووبارە دەکاتەوە، تا دەچێتە سەری؛ جا لە ڕەحمی خوا تەمابڕ مەبە و هەر هەوڵدە ، هەتا کەوتییە خوارێ ، پشت بەخوا ببەستە و هەوڵەکەت دووبارە کەوە .

((چونکە باوەڕدار دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە، جارێکی دی دەکەوێ و بەیەکجاریی هەڵدەستێتەوە و، ئەم جارە لەسەر ئەستێران دادەنیشێت ؛چونکە خوای هەمیشە زیندووی ڕاگری بوونەوەری دەگەڵە)). کەواتە: با هەمیشە هەوڵ و تێکۆشانی نەپساوەی مێروولەت لەیادبێت و ، ساردبوونەوە و نائومێدیی ڕووت تێنەکات ، چونکە نازانی کەنگێ دەرووت لێ دەکرێتەوە !

## دەست بەسەری هەتیو دابێنە و پاداشتی بەخشندەی میهرەبان وەدەست بێنە

لەپارێزگای (حەفرولباتین) و (شەقرا) ، سەردانی هەتیوانم کرد ، هەستم کرد دڵم زۆر نەرم بوو و پڕ بوو لە میهرەبانیی و، کە سەلامم لێ دەکردن و، دەستم بەسەریاندا دەهێنا و هانم دەدان ، زۆر چێژم وەردەگرت ،

هەندێکیان وتار و شیعریان بۆ دەخوێندینەوە و، باسی بەهرە و سەرکەوتنی خۆیان بۆدەکردین ، ئۆخژن و ئارامێکی زۆر دڵی داگرتین و، حەدیسەکەی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) هاتەوە بیر کە دەفەرموێ : (( أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا – ئەمن و سەرپەرشتی هەتیو لەبەهەشتێ ئاواین)) و، ئاماژەی بۆ قامکی شایەتمان و نێوەراستی کرد و کەمێك لێکی کردنەوە. رواه البخاري (٣٦٥). پێم گوتن : گەورەترین پیاوی جیهان هەتیو بووە – سەلامی خوای لێ بێ – و ، ئەو بابی هەتیوانە و ، لەجیات بابتان، ئێمە بەبابی خۆتان بزانن .

جا ئامۆژگاریی بێت ؛ سەرپەرشتیی هەتیوان بکە و ، تا دەتوانی دڵیان خۆشکە ؛ چونکە ئەوە دەبێتە هۆی تەمەن درێژی و شادمانیی و دڵکرانەوە و ، بەرەکەتی رزق و ڕۆزیی و پارازتنی خێزان و ماڵ و منداڵ. چەند جوانە لەگەڵ خەڵکی مەینەتبار ، کە کارەساتیان بەسەر هاتوە ، وەکو ئەو منداڵەی دایك و بابی ، یان یەکیانی لەدەستداوە، دانیشی و دڵی بدەیەوە و دڵنەوایی بکەی و دڵی خۆشکەی ، کەخوا بەو کارە ئاسودەیی و ئۆقرە و ئارامت پێ دەبەخشێت ! بۆخۆم تاقیم کردۆتەوە : هەرجارەی دەگەڵ هەتیوێك دانیشتبم ، زیاتر دڵخۆش و شادو ئاسوودە بوومە.

## کاری شێلگیرانە تەمی خەمت دەڕەوێنێ

لە (قەسیم) مامۆستایەکی زانکۆم ناسی کە پزیشکیش بوو، هاوکات دەرسی دەگوتەوە و بانگەوازی دەکرد و فتواشی دەدا ، سەرباری ئەوەی خوا پەرستییەکی چاکیشی دەکرد ؛ باوەڕم پێ بکەن لە ڕۆژی ئاساییدا ، لەماڵ یا یان لەسەفەر ، دە جزوو قورئانی دەخوێند ؛ واتا : بەسێ ڕۆژان خەتمی دەرکرد. ڕۆژانی هەینیش ، بەرەبەیان دەهاتە مزگەوت و ، دوای نوێژی بەیانی دەستی بەقورئان خوێندن دەکرد تا پێنج خولەك پێش هاتنی وتاربێژ و، وێڕای ئەوە لەزانکۆش دەرسی دەگوتەوە و سەرپەرشتی نامەی ماستەر و دوکتۆرای دەکرد و فتوای دەدا و وتاریشی پێشکەش دەکردن. ئەوەش هەمووی بەرەکەتی کاتە لەگەڵ هیمەتی بەرز و شێلگیریی لە بەخشین و قوربانیدانەدا. باشە ، پێتان وایە ، زاتێکی وەك ئەو مامۆستا بەرێزە ، کاتی بۆ خەم و خەفەت و نیگەرانیی هەیە؟! نا بەهیچ جۆرێك؛چونکە ئەو زانیویەتی چۆن ڕۆژ و شەوی خۆی وەبەربێنێ . جا ئەوەی دەیەوێ خەم و کەسەر لەدڵی دەرکات ، با کاتی بەفیرۆ نەدات و هەموو ساتەکانی وەبەربێنێت ؛ چونکە ئەگەر هەست و هۆش و بیرت بە شتی چاك و ڕەواوە خەریك نەکەی ، بە شتی خراپ و نا ڕەواوە خەریك دەبێت.

## بێبەشیی ڕێژەیی بەکاربێنە تام لە نیعمەت دەکەی

ئەوەی خووی بە تێر و تەسەلیی و زگ پڕ کردن لەخواردن گرتبێت ، تام لە خواردن ناکات و ، ئەوەی زۆر بنوێت ، بە نوستن ناحەسێتەوە ... هۆیەکەشی ئەوەیە کە شتێك ئەو کاتە تام و چێژی هەیە ، کە حەزت لێی بێت و تامەزرۆی بی ، دەتوانی تاقی بکەیەوە ؛ خۆت برسی کە ، پاشان خواردن بخۆ ، ئەو کاتە تامی لێ دەکەی و نرخی دەزانی و ، ئەگەر ڕۆژێك ئیشت کرد و ماندووبووی ، دوور لە نیگەرانیی و پەشێویی ، بەئاسوودەیی خەوێکی

قووڵت لێ دەکەوێ و چێژ لەخەوەکەت وەردەگری. جا هەوڵدە لە ژیانتدا بێبەشیی ڕێژەیی تاقی بکەیەوە، بزانە چۆن ئەنجامە چاکەکەی دەبینی و تەندروستیی و لەشساغیت دەستدەکەوێت ... ئەو کاتەی تینوو دەبی ، پاشان ئاوێکی سارد دەخۆیەوە ، تەماشای خۆت کە ، بزانە چۆن تامی لێ دەکەی و، ئەو نیعمەتە بەگەورە دەزانی و، لە ناخی دڵتەوە سوپاسی خوای لەسەر دەکەی ! نیعمەتەکانی دیکەش هەروا.... ئەوانەی لەنێو ناز و نیعمەتدا دەژین و زێدەڕۆیی تێدا دەکەن ، تام و چێژو ئاسوودەیی نابینن ؛ چونکە چاك و خراپ و ، برسیەتیی و تێریی و ، تێر ئاویی و تینوویتی و خەو و بێخەویی لێك ناکەنەوە. لە کاروبارتدا مامناوەندیی بە و، بێبەشیی ڕێژەیی بە کاربێنە و، ئەو کاتە نیعمەتی خوا بەکاربێنە کەبۆی تامەزرۆ و ئارەزوومەندی.

## ئەوەی لەسەرحیسابی گیانی بایەخ بە لەشی بدات  گیان و لەشی لەدەست دەچن

لە مەککە جەنابی شێخ موحەممەدی کوڕی ساڵحی عوسەیمینم دی – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – ڕستەیەکی (ئیبن سەعدیی)ی مامۆستایم بۆ باسکرد کە لە کتێبێکیدا بەناوی (الوسائل المفیدة في الحیاة السعیدة – ئامرازە بەکەڵکەکانی ژیانێکی بەختەوەر) نووسیویەتی و دەڵێ : (( بیرکردنەوە لەڕابردوو گەمژەیی و شێتییە)) ، پێم گوت: ئەو ڕستە لەکتێبی (( واز لە نیگەرانیی بێنەو دەست بەژیان بکە )) ی دیل کارنیگی – دا هەیە ؛ شێخ عوسەیمین گوتی : ئەو (شێخ سەعدیی)- ڕەحمەتی خوای لێ بێ – شتی ڕۆژئاواییەکان و ئەوانەی دەخوێندەوە ، دوایی قسە هاتە سەر ڕستەیەکی دی کە بریتی بوو لە : (( تا لەش خۆشگوزەرانتربێت ، گیان ئاڵۆزتر دەبێت )).. شێخ پشتگیریی ئەم ڕستەی کرد ، کە تێر و تەسەلیی و خۆشگوزەرانیی و دەست بلاَویی ، گیانی مرۆڤ ئاڵۆزدەکەن و ، دڵتەنگی و خەم و خەفەتیان پێوەیە. بیرم لەژیانی شێخ عوسەیمین کردەوە – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – چۆن لە جلك و خواردنیدا سادە و ساکار بوو و ، هێندە گوێی بە دنیا نەدەدا ، لەسادەیی ژیانی ورد بوومەوە ، کەبەهۆی ئەو سادەییەوە ، شاد و دڵکراوە بوو ، بایەخی بە تەندروستیی و پیادەڕۆیی دەدا و، پەیامی زانست و فێرکردن و بانگەوازی بەجوانیی ئەنجام دەدا. زانیم ئەوەیە ژیانی جوان و نموونەیی؛ بەپێچەوانەی بۆ چوونی هەندێك کەس کەوا دەزانن هەبوونی جلوبەرگ و خانووی زۆر و، خواردن و خواردنەوە لە جۆرەها خواردنگە و شتی لەم بابەتە، چێژو بەختەوەرییان دەداتێ ؛ چونکە فرە چەشنیی لەو شتانەدا ، بێ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن ، دەیانکاتە بەردەست و خزمەتکاری ئەو شتانە ؛ لەبەر ئەوەی بەردەوام خەریکی بەسەر ڕاگەیشتن و پارازتن و خزمەتکردنیان دەبن و ، بۆیان دەبنە مایەی دڵتەنگیی و خەم و خەفەت .... بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی تەنها بەگوێرەی پێویست سوود لەو شتانە وەردەگرن و، سەرقاڵی ئەنجامدانی پەیامی خۆیانن لەژیاندا و، ئارام و ئاسوودە و بەختەوەر دەژین . بۆیە دووبارەی دەکەمەوە : سادە بژی ؛ چونکە تا لەش خۆشگوزەرانتربێت ، گیان ئاڵۆزتر دەبێت و ، لەبیرت نەچێت کە ئێمە دەبێ شتەکان بەکاربێنین ، نەك خزمەتیان بکەین !

## سێ پزیشکی هەرەباش لە جیهاندا

لە تورکیا و سریلانکا و زۆر شاری سعوودیە ، هاوسەفەری جەنابی شێخ د.سەعیدی کوڕی موسفیربووم و ، لە نزیکەوە ناسیومە ، ئێستا تەمەنی نزیکەی هەشتا ساڵە و، لە زۆربەی ئەو گەنجانەی تەمەنیان سی ساڵە ، گورجوگۆڵترە ، هۆی ئەو چالاکیی و زیندوویی و شادییەم لێ پرسی ، پێی گوتم کە لەخواردندا بەپارێزە و لەکاتی دیاریکراودا خواردنی گونجاو هەڵدەبژێرێت و، خۆی لە خواردنی زیانبەخش و چەور و شیرین نادات و، لەسەر پیادە ڕۆیی بەردەوامە و، لەوەش گرنگتر ، زۆر یادی خوای گەورە دەکات و، لەسەر قورئان خوێندن و زکرەکانی بەیانیان و ئێواران بەردەوامە. لە سەفەرێ زۆر گورج و گۆڵ بوو و، چەند لاوێکی میدیاکارمان دەگەڵ بوون ، لەو تەمەنەشدا لە ڕووی پیادەڕۆیی و دڵخۆشیی و کار ڕاپەڕاندن و بەخشین و بانگەواز و بەرنامە تۆمار کردنەوە ، ئەو لەهەمووان گورج و گۆڵتر بوو . زانیم هۆیەکەی وەرزش و هەڵسوکەوتی لێزانانەیە دەگەڵ ژیان .

جا ئەگەر تۆ گەنجێکی قەڵەوت دی کە لەخواردنی شیرنیات و چەوریی، کە زیان بە تەندروستیی دەگەیەنن ، زێدەڕۆیی دەکات ، ئەوە گەنجیی و تەندروستیی لەدەست دەدات ، لە بەرانبەریشدا دەبینی مامۆستایەکی بەساڵداچووی هەشتا ساڵە ، بەهێز و گورجوگۆڵ و چالاکە ، چونکە بەپێی پێویست خواردنی خواردوە و پیادەڕۆیی کردووە و، لە پێش هەمووشیانەوە زۆر زکری خوای وەدیهێنەری کردوە. جا ئەو سێ شتانە: زکری بەردەوامی خوا کە دڵت خۆش دەکات و وزە و چالاکیت پێ دەبەخشێت و، پیادەڕۆیی بەردەوام کە قەڵەویی و ورگنیی ناهێڵێت و، خواردنی چاك و بەسوود و دوورکەوتنەوە لە خواردنی زیانبەخش ، هەموو ئەوانە وات لێ دەکەن تەندروستیت جێگیر بێت و، ژیانت ڕێك بێت و، کارەکانت بەهیمەت و گورجوگۆڵیی بکەی و، بەو پەڕی شادیی و دڵخۆشی ئەرکەکانت ڕاپەڕێنی . کەواتە : لەبیرت نەچێ ڕاوێژ بە سێ پزیشکەکە بکەی : تەسبیحات ، پارێز لەخواردن ، پیادەڕۆیی .

## سەرەنجام بەختەوەریی دۆزییەوە

ئەم گەنجە ، دوای ئەوەی نێوانی دەگەڵ دایکو بابی تێکچوو ، بڕیاریدا لەگەڵیان نەژیت و، ڕووی کردە (ڕیاز)ی پایتەخت .. لەوێ بۆ خوێندن چووە زانکۆ ، بەڵام بەهۆی ئەو برادەرە خراپانەی پێکەوە خەریکی شەونخوونیی و جگەرەکێشان و تەماشاکردنی فلیمی خراپ بوون، لە خوێندن شکستی هێنا و، زۆربەی برادەرەکانیشی ، لەبەر ئەو هەموو قەرزەی لێی دەکردن ، دەستیان لێ هەڵگرت ، ڕۆژێك کە بە کەناڵەکانی تەلەفزیۆندا دەگەڕا ، بەسەر دەرسێکی شێخ شەعراویدا کەوت ، کە قورئانی تەفسیر دەکرد، زۆر کاری تێکرد؛ دەستبەجێ هەستا چۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی کرد و، وردە وردە دەستی بە نوێژان کرد ، تا خوا دەرووی لێکردەوە و بەرێکوپێکیی نوێژەکانی دەکردن و، لە نشینگەی زانکۆ نیشتەجێ بوو ، پاشان هاوینێ چۆوە کن دایك و بابی و لێیان نزیکبۆوە و دەستی بەچاکەکاریی کرد دەگەڵیان ، ئەوانیش دوعای خێریان بۆ دەکرد ... تا زانکۆی تەواو کرد درێژەی بەخوێندن دا ،

پاشان ماستەری وەرگرت و لە کۆمپانیایەك دەستی بەئیش کرد.. ژنی هێنا و ژیانێکی خۆش و بەختەوەری پێکەوەنا ! سوێندی بەخوای گەورە دەخوارد، کە ئەو بەختەوەرییەی لە کردنی نوێژەکان و چاکەکردن لەگەڵ دایکو باوکدا دەیبینێ ، بەهەموو دنیای نادات. بەم جۆرە لەکۆتاییدا بۆی دەرکەوت کە ڕێگەی گومڕایی و هاوڕێیەتیی برادەری خراپ و کات بەفیڕۆدان و خووگرتن بە گوناح و تاوانەوە، شکست و لاڕێبوون و هەڵدێرانە و، ڕێگەی بەرەو خوا ، لەمزگەوتەوە دەست پێدەکات . جا ئەی لاوانی ئیسلام ، ڕۆژی پێنج جار گوێ لەبانگەوازی خوا بگرن و بەدەنگیەوە بچن؛ ئەگەر گوێتان لە (**الله اکبر الله اکبر** ) بوو ، دەست لە هەموو شتێك هەڵگرن و، دەستنوێژ هەڵگرن و ڕوو لەماڵەکانی خواکەن.

## سەربەخۆیی لە نیشتەجێبوون و کاردا

زۆرجاران کێشە دەکەوێتە نێوان خزمان ؛ لەبەر ئەوەی لەیەك شوێندا دەژین و ، زۆر تێکەڵاوی یەکدی دەبن ، سەرەنجام گێرە و کێشە و ناکۆکییان لەنێواندا دروست دەبێت، بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب – خوا لێی ڕازی بێت – دەیفەرموو: (( فەرمان بەخزمان بکەن با سەردانی یەکدی بکەن ، بەلاَم با جیرانی یەکدی نەبن ))، هەروا برادەرانیش ئەگەر لە  ئیشێکی بازرگانیی ، یان پرۆژەیەکی ئابووریدا پێکەوە بن ، ناکۆکیی و کێشەیان لێ پەیدا دەبێت؛چونکە حەز و ئارەزووەکان جۆراوجۆرن و تووشی گومان و دڕدۆنگیی زۆر دەبن و، برادەرایەتیی دەبێتە دوژمنایەتیی و، بەزۆریی ئەو کۆمپانیایانە لێك دەبنەوە. جا ئامۆژگاریم ئەوەیە لە خانوودا سەربەخۆبی و لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆت بژی و، خۆت لەو تێکەلاَوییە زۆرە بەدوور بگرە؛ چونکە دەبێتە هۆی وێککەوتنی خزمان و، قسە هێنان و بردن و، بەدگومانیی و حەسوودیی و ڕق و قین و، لەجیاتی ئەوە ، کات تەرخان کە ، لە کاتی پێویستدا سەردانیان بکە. بەلاَم لەکاری مەیدانیی و بازرگانیی و ئابووریدا بەتایبەتی ، سەربەخۆ بە و بۆخۆت کاروباری خۆت هەڵسووڕێنە و، تا دەتوانی لەشەریکایەتیی  و تێکەڵبوون دووركەوە؛چونکە بەزۆریی ناکۆکیی و کێشەی لێ دەکەوێتەوە و ، ئەوەم بەهەڵسەنگاندنی ژیان و ڕەوشی خەڵك بۆ ساغ بۆتەوە . ئەگەر بۆخۆت دەگەڵ خاووخێزانت، ژیانێکی سەربەخۆت هەبێت ، خۆت کۆدەکەیەوە و سەرقاڵی ئیشی خۆت دەبی و، لە کێشەو ناکۆکیی ڕزگار دەبی ، جا ئەوەت لەبەر چاوبێ و، بۆخۆت ئیشی خۆت ڕاپەڕێنە و، سەرپەرشتیی کاروباری خۆت بکە و، پشت بە پەروەردگاری خۆت ببەستە.

## بیرکەوە و تێڕامێنە و تەنها دەلاَلی زانیاریی مەبە

شێخی ڕەوانبێژیی ئەم سەردەمە ، د. موحەممەد موحەممەد ئەبو مووسا ، قسەیەکی هەیە ، زۆرم بەدڵە ، دەڵێ : (( کێشە ئەوەیە ئێمە زۆربەمان بووینەتە دەلاَڵ ؛ تەنها گوێزەرەوە و لاساکەرەوەی زانستی پێشینانمانین )).

ئەم قسە ڕاستە؛چونکەی زانستخوازان ، بەتایبەتی لە بوارەکانی شەریعەت و مێژوو و ئەدەب ، بوونەتە دەلاَڵی زانستی پێشینان و، هەڵیدەگرن و بەبێ تێگەیشتن و تێڕامان و گفتوگۆ، جێبەجێی دەکەن و، چاولێکەریی و

هەڵنەهێنجان و حاڵینەبوونیان بەسەردا زاڵە . خواش لە قورئاندا فەرمانی پێ کردووین ڕامێنین و بیربکەینەوە و، پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وسلم**) فەرمانی پێ کردووین لە دین شارەزا بین ، نەك هەر قسە و بۆ چوونی خەڵکی بگێڕینەوە . تەنانەت هەندێك كەس هەیە ، بیەوێ ئایەتێكمان بۆ لێكداتەوە ، بەرانبەرمان دادەنیشێت و دەڵێ: ئیبن جەریر وا دەڵێ و موجاهید وا دەڵێ و، ئیبن كەسیر وا دەڵێ و سیووتیی وا دەڵێ و، قورتوبیی وا دەڵێ و، زەمەخشەریی وادەڵێ ... هتد. ئێمەش پێی دەڵێین: ئەدی ئەتۆ چیی لێ تێدەگەی ؟ ئایا بۆخۆت لە قورئان وردنەبوویەوە؟ خوای گەورە دەفەرموێ :(( **أفلا يتدبرون القرآن ؟ - ئایا لە قورئان وردنابنەوە؟** )) زانستەكانی دیكەش بە هەمان شێوە .... تەنها كاتێك دەتوانین داهێنان و نوێكاریی ئەنجام بدەین ، كە پارێزگاریی لە ڕەسەنایەتیی نەتەوە و بیروباوەڕی ڕاست بكەین و، بۆ خۆشمان ئیجتیهاد بكەین و شتی لێ هەڵێنجین و، بۆخۆمان لێی وردبینەوە و بۆ خۆمان تێی بگەین و، كە تێگەیشتین و وردبووینەوە و بەرچاومان ڕوون بۆوە و شارەزا بووین ، عەقڵ و هۆشی خۆمان بكەینە سەرچاوەی داهێنانەكانمان؛چونكە دووبارەكردنەوەی قسەی خەڵكی ، ئەوە ئیشی تەسجیلە ، كە قسان تۆماردەكات و، هەركاتێك بتەوێت، لێی دەدەی و گوێی لێ دەگریەوە . با تێفكرین و وردبینەوە ؛ با هەوڵدەین بۆخۆمان لە قورئان و ڕێوشوێنی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) شارەزا بین ، خوا دەرووی فێربوونمان لێ دەكاتەوە ، پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) دەفەرموێ: ((**من يرد الله به خيرا ، يفقهه في الدين** – هەركەسێك خوا بیەوێت تووشی خێر و چاكەی بكات ، لەئایین شارەزای دەكات )) **متفق عليه** ( ١٥٠ ) ، ( ٨١٦ ).

## ئافرەتێكی لەسەر پێی خۆ ڕاوەستاو بوو بەنموونەی سەركەوتن و بەختەوەریی

باسی ئافرەتێكی وڵاتی خۆمانیان بۆ كردین ، مێردەكەی مردبوو و، چواركوڕی بچووكی لەپاش بەجێمابوون، خستنیە بەرخوێندن و، بۆ ئەو كارە هەندێك قەرزی كرد ، پاشان چووە پایتەخت و لەسەر پێ خوێندنیان بەردەوام بوو ، هەرچواریان لەسایەی خوا و سەرپەرشتی دایكە ئارام و باوەڕ بەخۆكەیان ، لەچەند بوارێكدا بوونە بلیمەتی سەركەوتوو؛ یەكیان لەئەندازە ، یەكیان لە پزیشكیی ، یەكیان لە فڕۆكەوانیی ، یەكیان لەبازرگانیی و، هەرچواریشیان ئەستێرەی بواری خۆیان بوون ، پاك و بێگەردیی بۆ خوا ، زەمانە سووڕا و، بەدایكە بەتەمەنەكەیان ڕاگەیشتن و، بەچاكترین شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ كرد و، ئەویش كەدیتی ئاوا بلیمەت و سەركەوتوون لە نێوكۆمەڵدا و، ناوبانگیان دەنگی داوەتەوە، زۆر دڵخۆش بوو و فرمێسكی شادی دەڕشت و سوپاسی خوای گەورەی دەكرد. ئەو ئافرەتە بەمشوورە ، زۆر لەگەڵیان ماندوو بوو بوو و، بۆ چاودێریی و پێگەیاندنیان و هاندانیان بۆ خوێندن و نوێژكردن لەكاتی خۆیدا و دوورخستنەوەیان لە برادەری خراپ شەونخوونیی كوێرەوەرییەكی زۆری چێژتبوو و، لەكاتی تاقیكردنەوەدا زۆر لەگەڵیان دەبوو ، تا بوونە نموونە و هەموو كەس بەچاكە باسی دەكردن . پاك و

بێگەردیی بۆ خوا ، ئەوەیە ئافرەتی نموونەی باوەڕ بەخۆ بوون و ئارام و لێهاتوویی کەداستانی سەرکەوتنی تۆمارکرد ، بۆ ئەوانەی تێدەگەن.

## برسیەتی بەنانی وشك لادەچێت

بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر، هاتم لە ڕیاز نیشتەجێ بووم ، هەندێك كەس گوتیان : خۆت بە بازرگانییەوە خەریك كە ، بیرم كردەوە دەگەڵ بازرگانێكی سعوودیی ، نووسینگەیەكی جیهانیی بەناوی (**المعارف**) یان (**شمس**) لە ڕیاز دانێین و، وامان پێ باش بوو دەرگای هاوبەشیی بكەینەوە بۆ هەركەسێك پێی خۆش بێت ، پلانمان دانا و چەندان كۆبونەوەمان كرد و، شەو و ڕۆژ خەریكی ئەو پرۆژە بووم؛ خوێندنەوەم كەم بۆوە و، لەبەر زۆریی كۆبوونەوە و پەیوەندیی ، زكریشم لە كورتی دا ، تا خوا بەهۆی بۆچوونێكی پیرۆزی د.عەبدوڵڵای كوڕی موحەممەد ئەمینی شەنقیتی ( كوڕی زانای خواناسی بەناوبانگ ) كە مامۆستای زانكۆیە ، دەرووی خێرم لێ كرایەوە . لە مەدینە هاتە لام ، زانی زۆر سەرقاڵم و هەر خەریكی ئەو پرۆژەم ، ئامۆژگارییەكی دەگمەنی زێڕینی كردم و گوتی: تۆ زانستخواز و بانگخوازی و، لەمەودوا دەچیە سەر ئەو شتانەی خوا تۆی بۆ ئەوان داوە و، سەرقاڵبوون و بەشداربوونت لەو كارە بازرگانییانە ، چەندان ئەرك و داخوازیی و ئەنجامی نادیاری لێ دەكەونەوە، پاشان قنیات كردن بەبەشی پێ ژیان بۆ زانستخواز، بەڵكو بۆ مسوڵمان بەگشتیی و، قەناعەت گەورەترین خەزێنەی دنیایە و، دواییش ئەم دێڕە شیعرەی بۆ خوێندمەوە :

**الجوع يُدفع بالرغيفِ اليابِسِ فعلام أكثرُ حسرتي و وساوسي؟!**

**نانێكی وشكیش بۆ برسیی باشە كەواتە: خەمی ڕۆزیی بەلاشە!**

ئەو قسەم كەوتە بەردڵی و، دووەم ڕۆژ داوای لێبوردنم لە خاوەنی پرۆژەكە و بەشداربووان كرد و، سەلامەت و دڵخۆش لێی هاتمەدەرێ و، ئاسوودەیی خۆم دەستكەوتەوە و، خەیاڵم ئاسوودە بوو و دڵم كرایەوە و، گەڕامەوە سەر زكر و تەسبیحات و قورئان خوێندنی خۆم و، خوێندنەوەی كتێبەكانم و بەدواداچوونی كتێبەكانم و، لەو نیگەرانیی و خەم و خەفەت و پەشێوییەی چەندان شەو و ڕۆژ ژیانیان لێ تاڵ كردبووم ، ڕزگار بووم.

ئەمن لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە ڕێی بازرگانیی و داوای ڕۆزیت لێ بگرم ، بەڵام (( **قد علم كل أناس مشربهم** – هەموو كەس بەهرەو شێوازی خۆی دەناسێ )) **الاعراف** ١٦٠ ، هەر كەسە خوا توانا و بەهرەیەكی پێ بەخشیوە ، ئەوەی ڕووی كردە بازرگانیی ، با بە سەربەخۆیی خەریكی بێت و، من داواش ناكەم سامانی بەشداربووان لە هیچ پرۆژەیەكدا هەڵگیرێتەوە و كۆبكرێتەوە؛ چونكە ئەوە باج و بارگرانییەكی زۆری لەسەرە و ئەنجامی خراپی دەبێ .

## كاری خۆت ڕاپەڕێنە و هیچ كارێكی شەرافەتمەندانەت پێ عەیب نەبێت

زۆربەی ئەو گەنجانەی دیتوومن و تووشی خەم و خەفەت و نیگەرانیی بوون ، یان دانەمەزراون ، یان داهاتێكی وایان نییە ، ئەمەش قەیرانێكە زۆرجار لای گەنجان و خەڵكی بەگشتیی دووبارە دەبێتەوە ، بێگومان مرۆڤی بیسەری بینا هەر دەبێ بیر لە پەیداكردنی داهاتێك بكاتەوە پێی بژیت و ئابڕووی خۆی پێ لەدەست لەخەڵك پانكردنەوە بپارێزێت. من ئامۆژگاریت دەكەم كە مشووری خۆت بخۆی و، هیچ كار و پیشەیەكی شەرافەتمەندانەت پێ عەیب نەبێ لە دەرۆزە و قەرز و بارگرانیی ئابووریت بپارێزێت و، هەر دەرفەتێكت بۆ پەیداكردنی سامانی حەلاڵ دەست كەوت ، لەدەست خۆتی مەدە . گەنجێك دەناسم لە زانكۆ دەرچووە ، بەلاّم ئیشی دەست نەكەوتوە ، لە زۆر دەرگای داوە ، بەلاّم بێ سوود بووە ، بازرگانێك كە سەوزە و میوە دەكڕێ و دەفرۆشێت ، پێی گوت: ئەو ئیشە بكە ، ئەویش دەستی پێكرد و سەوزە و میوەی بۆ دوكانان دەبرد، بەلاّم یان ڕاستەوخۆ بۆ خۆی دەیكرد ، یان بۆخۆشی دەگەڵ شوفێری سەیارەكە دەچوو، دەوڵەمەند بوو و ڕەوشی چاكبوو و، بە كابرایەكی گوتبوو: مانگێ بیست هەزار ڕیاڵ پاشەكەوت دەكات ! ئەوەش كارێكی چاكە و هیمەت بەرزیی و ئارام و خۆڕاگرییە ، كەواتە : دەست لەسەر دەست دامەنیشە ، خەفەت لەشت دابڕزێنێ و، كەسەر سینگت تەنگ كات ؛ بەڵكو چاوت لە بەرەكەتی خوابێ و، بكەوە ئیش ، با لەپڕۆژەیەكی بچووكی داهات كەمیشدا بێ ، چونكە لەوە باشترە پێویستیت بە خەڵك بێت و، دەستیان لەبەر پانكەیەوە ، دا خوا بتدەنێ ، یان نەتدەنێ ! دەرگاكانی ڕۆزیی یەك و دوو نین ، بەلاّم دەبێ كەسێك لێیان دات؛خوای گەورەش دەفەرموێ:((**فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض وابتغوا من فضل الله** – جا ئەگەر نوێژ تەواو بوو ، لەسەر زەوی (بۆ ئیش و كار) بلاّوبن و، داوای چاكە و نیعمەتەكانی خوا بكەن )) **الجمعة** (١٠).

## قەدی دارخورماكە بۆ خۆت ڕاوەشێنە خورمای نەرم و تازەت بەسەردا دەبارێنێ

قسەی خوای گەورە كە بە مەریەم دەفەرموێ: (( **وهزي اليك بجذع النخلة تساقط عليك رطبا جنيا** – قەدی خورماكە بۆ لای خۆت ڕاتەكێنە تا خورمای تەڕ و تازەت بەسەردا بێنەخوارێ ))، **مريم** (٢٥).

پەند و ئامۆژگاریی بۆ خەڵك تێدایە كە بۆ پەیداكردنی ڕۆزیی هەوڵ بدەن و ، لەنێو قاپێلكی سستیی و تەنبەڵیدا گرمۆڵە نەبن ؛ بەڵكو بچنە مەیدان و بگەڕێن و هەوڵدەن و ئیش بكەن ، خۆ خوای گەورە دەیتوانی خورمای نەرمی تازە بەسەر مەریەمدا ببارێنێ ، كاتێك خەریكی منداڵبوون بوو و ماندوو و كەلەلا بەدەستی ئازارەوە دەینالاّند ، بەلاّم خوای بالاّ دەست ، هۆكاری بۆ داواكردنی ڕزق و ڕۆزیی داناوە و، دەفەرموێ (( **وهزي اليك بجذع النخلة**–دار خورماكە بۆ لای خۆت ڕاوەشێنە)).

ئەوش جووڵەیەکی مەریەمە ، نیشانەی ئەوەیە کە بەرەکەت لە جووڵەدایە ، کەواتە: بجووڵێ و لە جێی خۆت مەمێنەوە ؛ چونکە ، مەگەر نەخۆشی کەنەفتی دەستەوستان ، دەنا هیچ زیندەوەرێك نییە لە جێی خۆی بمێنێتەوە و ڕۆزیشی بدرێتێ. هەنگ دەڕوا و دێتەوە ، مێروولە وەدەردەکەوێ و دەگەڕێ ، شێر دەچێ ڕاودەکات ، باڵندە زەوی هەڵدەکۆڵێ و دەگەڕێ ، هەموو زیندەوەرێك بەدوای ڕۆزیدا دەگەڕێ ، جا تۆش دەبێ هەوڵدەی و لە دەرگای جۆراوجۆر بدەی ، ئەگەر لە دەرگایەك سەرنەکەوتی ، لە یەکی دیکە بدە ، تا دەرگایەکت لێ دەکرێتەوە ، دیارە خواش لەقەدەر هەوڵ و ماندووبوون دەبەخشێت ، ڕۆزیت مسۆگەرە ، بەڵام دەبێ هەوڵ و ڕەنجی بۆ بدەی و ، کوێرەوەریی و ماندووبوون ببینی و ، خواش هەوڵت بەفیڕۆ نادات ؛ چونکە لەهەموو کەس بەخشندە و بەڕێزترە .

## لاق بە زەویدادە

قسەی خوای گەورە کە بە ئەییووبی دەڵێ : (( **أركض برجلك هذا مغتسل بارد وشراب – لاقت بە زەویدادە ، ئەوە کانییەك لەبن لاقت هەڵدەقوڵێ – ئاوێکی ساردە بۆ خۆشردن و خواردنەوە** )) **ص** ( ٤٢ ) ، بەڵگەیە لەسەر بەکارهێنانی هۆکار (سەبەب) بۆ چارەسەر و دەرمان و داوای چاکبوونەوە و، جووڵەی تێدایە و، جووڵەش بەرەکەتی تێدایە ، وێڕای سوودی پیادەڕەویی بۆ نەخۆش و، مرۆڤ نابێ تەسلیمی سستیی و تەنبەڵیی بێت و، لەجێی خۆی دانیشێت؛ چونکە ئەوە دژی تەندروستیی و داواکردنی ڕۆزیی حەلاڵ و ڕێ پێدراوە . خوای باڵا دەست دەیتوانی ئاو لە زەویی بۆ ئەییووب بێنێتە دەرێ ، بەڵام جووڵە و هۆکار بەکارهێنان ، تەنانەت بۆ نەخۆشیش ، هەر دەبێ هەبێت . قەت لەبیرم ناچێت ئەو کاتەی دوای نەشتەرگەریی ئەژنۆیانم ، لە شاری (میونیخ) ی ئەڵمانیا بووم ، کە (د.قوتنیی)ی ئەڵمانی ، کە نەشتەرگەرییەکەی بۆ کردم ، فەرمانی پێ دەکردم پیادەڕۆیی بکەم ، بە دیلمانج (مترجم) ە کەمی دەگوت : (( پێی بڵێ سەرباز چۆن پیادە ڕۆیی دەکەن ، ئاوا پیادە ڕۆیی بکات )) ، ئەمنیش ڕێکوپێك پیادەڕۆیی سەربازیم لەبەر دەمی دەکرد . یەکەم پرسیاریش کە هەموو ڕۆژێ لێی دەکردم ، دەیگوت: ئایا ئەمڕۆ پیادە ڕۆییت کردوە؟ جا ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە: قەت واز لە پیادەڕۆیی مەهێنە؛چونکە هەموو فشارێکی دەروونیی لادەبات و، سووڕی خوێنت نوێ دەکاتەوە و، ئەگەر دەگەڵ پیادەڕەوییەکە زکر و تەسبیحاتی خوای گەورەش بکەی ، ئەوە دڵت دەکرێتەوە و ئاسوودە و شادمان دەبی . بجووڵێ و لاق بەعەرزێ دادە و پیادە ڕۆیی بکە ، دڵخۆش و بەختەوەر دەبی .

## بە ملکەچیی نوێژ بکە بەختەوەر دەبی

لێکۆڵینەوەیەکی جوانم دەربارەی شوێنەوارەکانی نوێژی ملکەچانە و، سوودەکانی ئێستا و داهاتووی خوێندەوە ، کە یەك لە زانستخوازان نووسیبووی؛ لەبەرئەوە ئەمنیش دەستم پێکرد خۆم ماندوو دەکرد کە لەدوای نوێژ دابەستن ، هۆش و دڵم وریا بن و بزانم دەڵێم چی و لە قسەی پەروەردگارم وردبمەوە ، تامێکی دیکەم لە نوێژ کرد و، زۆر لەو نوێژە جیا بوو، کە بەبێ ئاگایی دەمکرد ، ئەوەم هاتەوە یاد کە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** ئەگەر تووشی

کێشەیەك بووبا دەیگوت : (( **أرحنا بالصلاة يا بلال** – بیلال ، بەنوێژ بمانحەسێنەوە )) **إسناده صحيح مشكاة المصباح** (١٢٠٩)، جا تۆش ئەگەر تووشی گرفتێك هاتی ، كە نوێژ بوو ، بە هێمنیی و وریایی و ملكەچیی نوێژەكەت بكە و ، ئەگەر نوێژی سوننەتیشت كرد ، دڵت وریاكەوە و دوو ڕكات بەهۆشیاریی و ملكەچیی بكە و، لە ناخی ڕووحتەوە ڕاز و نیاز لەگەڵ خوا بكە ، دەگەیە هەواری بەختەوەریی و، دڵت پڕ دەبێ لە خۆشیی و شادیی ، خوای گەورە دەفەرموێ : (( **واستعينوا بالصبر والصلاة وإنها لكبيرة إلا على الخاشعين** – یارمەتیش لەسەبر و نوێژ بخوازن ، ئەوەش لەسەر شانی ملكەچان نەبێت ، گرانە )) **البقرة** (٤٥). بێگومان نوێژو سەبر، گەورەترین پشتیوانن بۆ ڕاپەڕاندنی كاروباری ژیان ، خوا كۆمەكی ئێمە و ئێوەش بكات بۆ زكر و سوپاسكردنی و چاك پەرستنی .

## هیمەت نامرێ ؛ بەڵكو دەگەڵ گەوران گەورە دەبێت

مامۆستای فەرموودەوان ، زانای گەورە : ( سالَحی كوڕی ئەحمەدی شامیی ) ی نووسەری كتێبی ( **الجمع بين الصحيحين** ) و (**الكتب التسعة**) و دەیان كتێبی بەسوودی دیكە لەسەر فەرموودەم دیت ، تەماشامكرد تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێپەڕیوە ، لەگەڵ ئەوەشدا لە هیمەت و گورجوگۆڵیدا كەم وێنەیە ، هەر كە پڕۆژەیەكی تەواو دەكرد ، بە پێداگریی و سەبرێكی سەیرەوە ، بیری لە پڕۆژەیەكی دیكە دەكردەوە و، ئەو هەموو كتێبە زۆرانەی ئەو نووسیبوونی ، بە كۆمەڵێكی زانستیی لە گەنجان نەدەنووسران، وێڕای ئەوەش ، دەتدی هەمیشە خەریكی ئامادەكاریی و سەرنج نووسین و كۆكردنەوە و هەڵبژاردن و بەش بەش كردنە و، زۆر بەگوڕوتین و كار پوختە ، چەندەها جار دەگەڵی دانیشتم ، ڕۆژ لەڕۆژێ لە ڕووی هەست و ڕووح و بەرهەم و كار پوختییەوە ، گورجوگۆڵتر بوو. هەرچەندە من دەیان ، بەڵكو سەدان گەنج دەناسم ، سەرباری هێزی جەستە و خۆشگوزەرانیی و هەبوونی كات ، نەپەڕێكیان نووسیوە ، نەوتارێكیان لەمەڕ ئامۆژگاریی و ئاڕاستەكردنی خەڵك داوە ، نە پڕۆژەیەكیان هەیە ، شایانی باس بێت . زانیم بابەتەكە هیمەتە و، هەركەسێك خوا هیمەتی دابێتێ ، ئەوە كلیلی سەركەوتنی دراوەتێ .

خوای گەورە هیمەتی بەرزمان پێ ببەخشێت و، هەموو دەرگایەكی خێر و خۆشیمان لێ بكاتەوە .

## لەهەر شوێنێك بم بەرەكەتدارە

لە هەر شوێنێك نیشتەجێ بووی ، یان سەفەرت كرد ، بە چاكە كاریی و زكری خوا و، سەبر و ڕەوشت جوانیی و میهرەبانیی و بێفیزیت ، بەرەكەتدار بە ، وەك ئەو بارانەی لە هەر شوێنێك بباریٚ ، سوودی پێ دەگەیەنێت؛ ئەو كاتە خەڵك هۆگرت دەبن و دەبیە دڵنشینیان و، بە هاتنت دڵخۆش دەبن و، خواخوایانە دەگەڵت دانیشن.

ئەمن بۆخۆم مامۆستای فەرموودەوانی پایەبەرز: (عەبدولقادر ئەڕنەئۆت)م دیتوە ، كە چەندان كتێبی وەكو (**جامع الاصول**) ی ئیبنولئەسیری ساغ كردوونەتەوە و پەراوێزی لێ ناون ؛ لە هەموو دیدار و دانیشتنێكدا پێداگریی

لەسەر سوود و کەڵك بەخشین بەبرادەر دەکرد، بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وسلم**) ، یان سوودێکی زانستیی و، بەشێوازێکی سادەی ڕووحسووکانە و، ڕەوشت بەرز و بێ فیز و لێوبەبزە ، کۆڕ و مەجلیسەکەی بە ئامۆژگارییەك ، یان قسەیەکی بەسوود هەر دەڕازاندەوە و ، هەر جارێکی ئامادەی کۆڕێك یان دانیشتنێکی باین ، پڕی دەکرد لە قسەی بەسوود ، تەنانەت هەندێك لە ئامادەبووان ، خامە و کاغەزیان دەردەهێنا و ئەو سوودە زۆرانەیان دەنووسینەوە .... چونکە قەت مۆڵەتی نەدەدا کاتی دانیشتنەکە بە قسە و قسەلۆك و غەیبەت و بابەتی بێکەڵك ، بەفیڕۆ بڕوات. جا با مسوڵمان بەو جۆرە لەدانیشتنی دەگەڵ خەڵك ، لەسەر کاتی تایبەتی خۆی مکووڕ بێت و ، باسی ئایەتێك ، حەدیسێك ، حوکمێکی شەرعیی ، یان شتێکی دیکەی بەسوودبکات ، یان دەگەڵ برادەرەکانی ، باسی شتێك بکەن سوودی هەمووانی تێدابێت.

## مێژوو بە بەرزەفڕیی پاڵەوانان و هیمەتی مەردان دەنووسرێ

لە(عەممان) ی پایتەختی ئەردەن ، سەردانی مامۆستای حافزی فەرموودەوان ، (شوعەیب ئەرنەئۆت)م کرد – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – کە توێژەرەوەی کتێبی (**العواصم و القواصم**) ی ئیبنولوەزیرو (مسند أحمد) و چەندان کتێبی دیکەی لەمەڕ ڕێوشوێن(**سُنَّة**)ی پێغەمبەرە (**صلی الله علیه وسلم**). دیتم بیر لە ئیخراجی (**فتح الباري**)ی (**ابن حجر**) دەکاتەوە ، ئەوە بوو دواتر تەواوی کرد ، هەرچەندە لە حەفتاساڵ تێپەڕیبوو و نەخۆشیش بوو ، بەلاّم بەدرێژایی دانیشتنەکە هەر بیری لە پڕۆژەکانی داهاتووی دەکردەوە و، ڕووحە شەیدا و بەرزە فڕو داهێنەرەکەی ، نەیدەزانی کۆڵدان و دانیشتن و تێشکان چییە؟ هیمەتی وا بەرز ، خوای گەورە دەیداتە هەرکەسێکی حەزی لێ بێت ؛ تەماشاکە چۆن ئەو زانا فەرموودەوانە ، بەوپەڕی ئارام و خۆڕاگریی ، خەریکی ساغکردنەوەی دەیان کتێبی گەورەیە ، کە توێژینەوە و وردکردنەوە و ڕێکخستنی دەوێت و ، هەر کە پڕۆژەیەکیشی تەواوکرد ، دەچێتە سەر یەکی دیکە. گیانی بابای بڕوادار ئاوا عاشق و بەرزەفڕ و هیوادارە و ، لە حەدیسیشدا هاتوە : ((**لایشبع مؤمن من خیر حتی تکون منتهاه الجنة** – مرۆڤی باوەڕدار بەردەوام هەر خەریکی خێرو چاکەیە ، لەچاکە کردن تێر نابێت و، تا سەرەنجامی بە بەهەشت دەگات)) **رواه الترمذي وقال حدیث حسن**. جا ئامۆژگاریت دەکەم با ؛ گیانت هەمیشە شەیدا و بەرزەفڕ و هیمەتت بەرزبێ ، بەختەوەر و سەرفرازدەبی ؛ چونکە خەڵك بەهیمەت بەئامانج دەگات ، نەك بەلەش .

**همة تنطح الثریا        وعزم نبوي یزعزج الجبالا**

هیمەتێك بەرز سەری لەئاسمان        ئاواتێك بەهێز هەڵکەنێ کێوان

شاعیرێکی فارسیش دەڵێ: بەدڵساردی مەوێژە:چی لە من دێ؟  لە خۆبوردوو بە کێوت بۆ لە بندێ

## خەریکی ئیشی خۆت بە بەختەوەر دەبی

گەورەترین کتێب لەسەر ڕێوشوێن (**سنة**)ی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) لای من لەم سەردەمەدا ، (**المسند المصنف المعلل**)ی (بەشار عەوواد مەعرووف) و هاوڕێکانیەتی ، کە چل و سێ بەرگە و، من پێم وایە لە ڕووی ساغکردنەوە و وردکردنەوە و ڕێکوپێکییەوە ، لە هەموو کتێبەکانی فەرموودە دەوڵەمەندترە. پاش ئەوەی چەند بەرگێکم لێ خوێندنەوە ، پێوەندیم بە مامۆستا بەشار عەوواد مەعرووفەوە کرد – کەلەئەردەنە – زۆرم ستایش کرد و دوعای بەخێرم بۆکرد... پێی گوتم لە بەرنامەیدایە (**المحلى**)ی ئیبنوحەزم ساغ بکاتەوە و، پاشان بچێتە سەر (**التمهيد**)ی (**ابن عبدالبر**) و بەو جۆرە بەردەوام بێت. من چەند کتێبێکی دیکەشم دەربارەی ڕێوشوێن (**سنة**)ی پێغەمبەر(**صلى الله عليه وسلم**) کە د.بەشار عەوواد مەعروف ساغی کردوونەتەوە؛ وەکو (**تهذيب الكمال**) و (**المسند الجامع**) و هەندێکی دیکەش خوێندوونەتەوە، تەماشامکردوە سەبرو خۆڕاگرییەکی سەیرو کەم وێنەی تێدا بەکارهێناون ... پاشان ڕووبەڕوو چاوم پێکەوت ؛ دیتم خۆی تەرخان کردوە ، ڕۆژانە لەدوای نوێژی بەیانییەوە چەند لاپەڕەیەك هەر ساغ کاتەوە و مەگەر بۆ سەرخەو شکاندنێکی کەم ، یان نوێژێکی فەرز ، دەنا لێی دانابڕێت... ئیدی هۆکاری ئەو هەموو بەرهەمە بەسوودەم زانی ؛ کە سەبرو خۆڕاگرییەکی کەم وێنەبوو ، سووریش دەزانم کە د.بەشار عەوواد مەعروف هیچ کاتی بۆ خەم و خەفەت نییە ؛ چونکە هەموو کاتی خۆی وەبەرهێناوە و، ژیانی خۆی لەئیشی شێلگیرانەی بەرهەمداری ڕێك و ڕاست پڕکردووە . ئەمنیش پێت دەڵێم : ئەگەر کاتی خۆت بە ئیش و کار و خواپەرستیی و قورئان خوێندن وا پڕکرد بۆشایی تێدا نەمێنێ ، ئایا کاتت بۆ خەم و خەفەت و نیگەرانیی دەمێنێ ؟! بێگومان کاری بەسوودی بەرهەمدار، باشترین دەرمانی خەم و خەفەت و پەشێویی و نیگەرانییە لە جیهاندا .

## لەدوای فەتح کۆچ کردن نییە

چوومە کتێبخانە، کتێبی ( **فتح الباري لشرح صحيح البخاري**)ی (**إبنُ حجر**) بکڕم ، بە سێ سەت ڕیاڵ بوو ، کتێبەکەم هەڵگرت و پارەکەم دا ، پاشان دەستم بە بیرکردنەوە کرد لەو هەوڵ و ڕەنجەی ئەو نووسەرە لە پێشەکیی کتێبەکەدا کێشاویەتی و، ئەو ئازایەتیی و خۆڕاگرییە کەم وێنەی کە سی ودوو ساڵ بە ساغکردنەوە و وردکردنەو و تۆێژینەوە و ڕێکخستنیەوە خەریك بووە، کە ئەگەر بڵێم: لە ڕووی ساغکردنەوە و وردبینیی و ڕەسەنایەتییەوە ، کتێبی (**فتح الباري**) لە هەموو کتێبەکانی پێشوو مەزن و گرنگترە ، زێدەڕۆییم نەکردووە. تەنانەت (شەوکانیی) ، کاتێك لێیان پرسی : بەتەمانی (**صحيح البخاري**) شەرح کەی؟ گوتی لەدوای فەتح (مەبەستی – **فتح الباري**)یە کۆچکردن نییە.

پاشان بیرم لەنرخەکەی کردەوە؛ سێ سەت ڕیاڵ؛ نرخی جەمە خواردنی نەفەرێکە ، یان نیونێری کولاو ، برژاو یان سوورکراوە کە دەخورێت و دەبڕێتەوە و، پاشان لەشوێنێکی دوور – کەخۆتان دەزانن – فڕێ دەدرێت.

بەڵام ئەو پارەی بە(**فتح الباري**) دەدەین ، ئەگەر بێتو بیخوێنینەوە و تێی بگەین ، ئەوەندەمان بەرز دەکاتەوە ، دەمانباتە سەر ئەستێران و، لە ڕێوشوێنی پێغەمبەری پێشەوامان (**صلى الله عليه وسلم**) شارەزا دەکات و، خەم و خەفەتمان دەڕەوێنێ و، دەمانخاتە سەر ڕاستەڕێی پەرستنی خوای هەمیشە زیندووی ڕاگری بوونەوەر. باشە ئێمە بۆ تێنافکرین ؟ بۆ لەژیانی خۆمان ناکۆڵینەوە؟ بۆ بیر لەو هەموو سامانە ناکەینەوە ، زیاد لەپێویست لە لەشی خۆمان سەرفکردوە و، ڕووحی خۆمان پشت گوێ خستوە؟ بۆ بەتەواویی ڕێز لەزانست ناگرین ؟ بۆچی شتەکان بەگوێرەی پێویستیی و لەپێشیی ، ڕیز ناکەین ؟ بۆچی بەپێی بەها ڕاستەقینەکان ، نەك بەها ساختەکان و ڕواڵەتە هەڵخەڵەتێنەرە درۆزنەکان ، شتەکان هەڵناسەنگێنین .

## سێ خەسڵەتی سەرکەوتووە بەختەوەرەکان

لە بیرەوەریەکانی مامۆستایەکدا خوێندوومەتەوە ،کە ئەگەر لەم سەردەمەدا مسوڵمانان شانازیی بە کتێبێکەوە بکەن ، ئەو کتێبە (**الاعلام للزركلي**) یە ؛ ئەو کتێبەم پەیداکرد و، سێ جارم خوێندەوە ، بۆم دەرکەوت ئەو خەسڵەتانەی بلیمەتان و داهێنەرانی هەر بوارێك تێیاندا هاوبەشن ، بریتین لە : هیمەت بەرزیی ، کات بەفیرۆنەدان ، خۆهەڵنەقورتاندن لە ئیش و کاری خەڵك . ئەو بلیمەتانە تەنها بە هیمەت بەرزیی و یەکلابوونەوە ، گەیشتوونەتە  ئەو پلە و پایە ؛ ئەوانە مرۆڤی ئاسایی نین ، لە هیچ بوارێکدا زانست ، ئەدەب ، داهێنان ، سەرۆکایەتیی ، سامان ، بە پلەی نزم قایل نین ، هەروا کاتیان بەفیڕۆ نادەن و هەموویان لەهەربوارێکدا ئیش بکەن ، هەناسە ژمێریی دەکەن ، تا بەئامانج بگەن و، هەموویان دەستیان لەوشتانە هەڵگرتوە پەیوەندییان بەوانەوە نییە و، پرۆژەکانیان لێ تێکدەدەن و، هەموو هەوڵێکیان لەسەر ئەو بوارە چڕ دەکەنەوە ، ئیشی تێدا دەکەن و، بەم جۆرە بە ئامانج گەیشتوون و کارەکەیان بەرهەمداربووە ، لەبەر ئەوە لە دووهەزار ساڵ لەمەوبەرەوە و زیاتریش ، ناویان تۆمارکراوە ، چونکە کتێبەکەی لەسەردەمی نەفامیی و پێشتریشەوە دەست پێکردوە ، تەنانەت ناوی پێغەمبەرانیشی (**صلى الله عليه وسلم**) هێناوە و، چۆتە سەر پیاوچاکان و زانایان و بەخشندەکان و میرەکان و وەزیرەکان و فەرمانڕەوایان و ئازایان و زۆرکەسی دیکەش .. ئەوانەن ئەو ئەستێرانەی هەتا هەتایە لە ئاسمانی یادگەی مێژوودا دەدرەوشێنەوە. بەڵام خەڵکی بێ هیمەت و پشت سارد و نائومێد ، کە گوێ بە کاتی خۆیان نادەن و، هەموو تەمەنیان لە قسەی بێهوودە و شتی هیچدا بەسەر دەبەن ، ئەوانە لە لیستی ڕابەران و دیوانی داهێنەران و فەرهەنگی سەرکەوتوواندا جێیان نابێتەوە .... کەواتە : ئاگاداربە ، ئاگاداربە ، ئاگاداربە !

## کردنی مرۆڤ بە ئامێر

دووجار چوومە نیوویۆرك و، لەهۆڵی فڕۆکەخانەو چەندان شوێنی دیکە دانیشتم لە مرۆڤی ئەوێ وردەبوومەوە؛ دەمدیت هەناسە بڕکێیەتی و لە ژاوەژاوێکی بەرزدا ، بەتاڵووکە بۆ جێکارو کارگەو دووکان و نوسینگەکەی دەچێت و ، لەپێناوی دنیادا ، لە ڕاکەڕاکێکی تینپڕووکێندایە و، هیچ نێوبڕێکی نوێژو قورئان خوێندن و زکر و تەسبیحات

و تێڕامان ، له ژیانیدا نییه ، بەڵكو ژیانی تەنها ژیانێكی تەواو ئامێرییه و، بەشێوەیەكی ئوتوماتیكی وەكو كەشیی هەڵم دەسووڕێتەوە و ، وەكو ترۆمبێل و فڕۆكه لەگەڕدایه. لەوێ ژیانیان له ڕووح و گیان و هەموو ئامانجێكی دنیا و دوا ڕۆژ خاڵییەوە ، هیچ پێوەندییەك لەنێوان دروستكەر و دروستكراودا نییه ؛ ژیانێكی ماددیی زەمینیی خاكیی ڕووته و، نه كڕنووشێكی بەدڵی تێدایه ، نه زكر و تەسبیحاتێكی ڕاستگۆیانه ، نه فرمێسكێكی ئیلهامبەخش ، نه بزەیەكی كاریگەر ، نه قورئان خوێندنێكی به ڕامانەوە ؛ بەڵكو هەر كار و كوێرەوەریی بەردەوام لەپێناوی دۆلاردا و هیچی دی ! له خۆم دەپرسی : ئایا ئامانجی ژیان ئەوەیه ؟ ئایا له پێناوی ئەمەدا دروستكراوین ؟ ئەدی دوای ئەوە چییه؟ له كۆشككەلی سەر لەنێو هەوران نیشتەجێ بوون ، كەشتیی و پاپۆڕی هەرە گەورە دەئاژۆن و ، گەیشتوونەتە مەریخ و عەتارد ، بەڵام به چ دەچی ؟! به دەست خەم و خەفەت و پەشێویی و نیگەرانییەوە دەناڵێنن ! ئەدی كوانێ ئامانجی دروستكردن ؟ كوانێ ڕێگەی بەرەو خوا ؟ كوانێ ئەو ژیانەی ئاسوودەیی ڕووح و لەش و، دنیا و دوارۆژ و، دنیای پەنهان و دنیای دیار ، لێك گرێ دەدات ؟! دوای دیتنی ئەو دیمەنانه ، گەورەیی دینەكەم و نوێژەكەم و قورئان خوێندنەكەم زیاتر بۆ ڕوونبۆوە ... سوپاس و ستایش بۆ خوای مەزن ....

## سێ شتی چاك كەلەژیانماندا پشتگوێمان خستوون

سێ شتی چاك ؛ بەڵكو سێ نیعمەت هەن ، پشتگوێمان خستوون و، لەبیرمان كردوون و، دەستمان لێ بەرداون:

یەكەم: زوو نوستن: زانایان و پزیشكان پێداگرییان لەسەر گرنگیی ئەم نیعمەتە و، كاریگەریی لەسەر گیان و لەش كردوە؛ هەڵبەتە ئەوە ڕێوشوێنی پێغەمبەرە **(صلى الله عليه وسلم)** ، بەڵام حەیفێ ئێمە خوومان به شەونخونیی تا دوای نیوەشەوەوە گرتوە! دووەم: نیعمەتی زوو لەخەو هەستان و پێشوازیكردن لەژیان ؛ بێگومان ئەوە دەستووری خوایه له نێو گەردوون و مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەكدا ، پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)**دەفەرموێ: ((**اللهم بارك لأمتي في بكورها** – خوایەگیان ، بەرەكەت بخە بەرەبەیانان بۆ نەتەوەكەم )) **رواه الترمذي**. ئەو ڕۆژە چەند خۆشه كه هەر لەسەرەتاوە به گورجوگۆڵیی و كار و تێكۆشانەوە پێشوازیی لێ دەكەی ! سێیەم: پیادەڕۆیی ، ئێستا خەڵك زۆر كەم بەپێیان دەڕوات، ڕازی جووڵه و تەندروستیی و ئاسوودەییش، پیادەڕۆییه و، ئەوەی واز له پیادەڕۆ بێنێ ، پیادەڕۆییش وازی لێ دێنێ و، هەركەسێك بایەخ به وەرزشی پیادەڕۆیی نەدات و، لەسەری بەردەوام نەبێت، وەكو پزیشكەكان دەڵێن ، تووشی جۆرەها دەرد و نەخۆشی دەبێت . با بگەڕێینەوە سەر ژیانی ڕاستەقینەی سادە و ساكار كه لەگەڵ سروشت هاوئاهەنگە و لەگەڵ گیانی مرۆڤیش دێتەوە: زوونوستن، زووهەستان، بەرنامەیەكی ڕۆژانه بۆ پیادە ڕەویی، بۆ ئەوەی تەندروستیی و ئاسوودەیی و بەختیاریی وەدەست بێنینەوە.

## دڵساغیی بەهەشتی دنیایە

لە ڕیاز ، دە ساڵان دراوسێی زانایەکی خواپەرستی دنیا بەکەمگر بووم – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – کەتەمەنی نزیکەی نەوەت ساڵ دەبوو ، پیاوێکی زۆر دڵساغ و سینە ساف بوو ، حەسوودیی بە کەسەوە نەدەبرد ، ڕقی لە کەس نەبوو ، بوغز و کینەی لە دڵ نەدەگرت ، زکری خوای زۆر دەکرد و، هەر بە سێ ڕۆژان جارێك قوڕئانی خەتم دەکرد ، شەونوێژی دەکرد و، لە هەر کۆڕو مەجلیسێك با ، پڕی دەکرد لەزکر و تەسبیحات ، هەتا دەگەڵی دادەنیشتم ، ئیمان و ئاسوودەیی و دڵخۆشیی و خێرخوازیم زیادی دەکرد ، نەیدەهێشت کەس لە مەجلیسی وی غەیبەت بکات ، وەکو پێشینانی چاك ، لە قسەوقسەلۆك دوور و، سەرقاڵی ئیش و کاری خۆی بوو. شتێك کە لەو زانایەدا زۆر سەرنجی ڕاکێشام ، ئەوەبوو کە: تەواو خۆی لە دوژمنایەتیی و ڕق و قین ئاسوودە کردبوو و، بە چاکە نەبا ، باسی کەسی نەدەکرد و، ئەگەر لەکن وی غەیبەتی کەسێکیان کردبا ، داوای لێخۆشبوونی بۆ وی و بۆ هەموو مسوڵمانان لە خوا دەکرد. بەڕاستیی دڵساغیی ، دەست بەجێ خاوەنەکەی ئاسوودە دەکات و، دڵ داکەوتن و خەیاڵ ئاسوودەیی و حەسانەوەی ڕووحی پێ دەبەخشێت و، لە پاشە ڕۆژیشدا بۆی دەبێتە مایەی پاداشتی خوا ! جائایا ئامادەین دڵ و دەروونمان لە ڕق و قین پاك کەینەوە؟ ئایا گیانمان دەشۆین و لەحەسوودیی و بوغز پاکی دەکەینەوە ، بۆ ئەوەی بەئاشتیی و ئاسوودەیی و بەختەوەریی بژین ؟! ئەوەش پێش بەهەشتی دواڕۆژ ، بەهەشتی دنیایە ... خوا ڕەحم بە ئێمە و بە ئێوەش بکات .... ((**ونزعنا ما في صدورهم من غل ، إخوانا على سرر متقابلين** – هەر ڕق و قینێکی لەدڵەکانیاندا بوو ، دەرمان هێناو هەموویان بوونە برای بەرانبەر یەك (دانیشتوو) )) **الحجر**(٤٧).

## باوەڕدار تا تەمەنی زیاتر بێ،چاکترە

سوپاسی خوا دەکەم تا تەمەنم زیاتر هەڵدەکشێت ، لەڕووی زانست و ئەزموون و تێگەیشتنەوە ، لەجاران چاتر دەبم ؛ لەبەر ئەوە تەواو لەفەرمایشتی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** تێگەیشتم ، کەدەفەرموێ : (( **وإنَّهُ لايزيدُ عمرُ المؤمنِ إلاَّ خيراً** – باوەڕدار تا تەمەنی زیاتر بێت ، چاکترە )) **رواه مسلم** (٢٦٨٢). چونکە تەمەن درێژیی ، دەرفەتی تۆبە و گەڕانەوە لای خوا و ئەنجامدانی کردەوەی چاکت دەداتێ و، چاکەکانت چەندقات دەبن و، خراپەکانت ڕەشدەبنەوە. کەواتە : هەموو خولەکێکی تەمەنت بە هەل بزانە و لەپێناوی خوادا چاکەی تێدابکە و، تۆوی چاکەی تێدا بچێنە ، تا لە پاشەڕۆژدا بەرەکەی لە بەهەشتدا ببینی و، هەرچەندە ڕۆژان بێن و بگۆڕێن و خۆشیی و ناخۆشیت بەسەر بێن ، زیاتر پەند وەرگرە و، ببکە مایەی تێگەیشتن و هۆش و وریایی زیاتر و، لە باوەڕ بەخوادا هەر لەسەر یەك حاڵەت بە ، وەکو موتەنەبیی دەڵێ :

**وحالاتُ الزَّمانِ عليك شتَّى وحالك واحدٌ في كلِّ حالِ**

زەمان ڕەوشی جیا دێنێتە گۆڕێ تۆ وەکو خۆت بە ، (ڕەوش)ت نەگۆڕێ

هەموو ڕۆژێك بە تەمەنێکی نوێ بزانە و، پڕی کە لەخێر و چاکە و زکر و ستایشی خوا و، هەر ڕەوشێك مافی خۆی بدەیە ؛ نیعمەت سوپاسی هەیە و بەلاٌ و کارەسات ، سەبر و، تاوان و گوناح ، تۆبە و، بێئاگاییش زکر ...... کەواتە: لە هەموو بارودۆخێکدا خوای خۆت بپەرستە و، کارنامەکەت پڕکە لە خێر و چاکە.

## بەلاٌ بگۆڕە بۆ بەخشش

دەسالٌ ڕەبەق ، بەبێ دەرس و موحازەرە و ئیش و کار و کۆڕ و بەشداریی ڕاگەیاندن، لەڕیاز مامەوە ، شەو و ڕۆژم زۆر بەناخۆشیی لە بێ ئیشییەکی سەیردا بەسەر دەبرد ، پاشان خوای گەورە ڕێنومایی کردم ، لەدوای نوێژە فەرزەکان کاتەکەم سەرلەنوێ لەزانستخوازیی و نووسیندا وەبەربێنم ، ئیدی دەستم بە خوێندنەوە و نووسین و پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوە کرد و ، لەنێو کتێبخانەکەمدا دەگەڕام و ، لەو ماوەدا زیاتر لە چل کتێبم نووسی ، وەکو: ( **لا تحزن** - خەمبارمەبە ) ،( **أسعد إمرأة في العالم** – بەختەوەرترین ژن لەدنیادا ) ، ( **التفسير الميسر**- تەفسیری ئاسان ) ، ( **حدائق ذات بهجة**- چەند باخێکی ڕازاوە ) ، ( **هكذا حدثنا الزمان**- زەمانە ئاوای پێ گوتین ) ، ( **أمام عينيي** – لەپێش چاوانم ) و چەندان کتێبی دیکە. کوڕە نەمرەکانم (کتێبەکانم) بە چاوی خۆم دیتن و، لەو کاتەدا ، کە کاتی بێ ئیشیی و دەستبەتاڵییەکی درێژبوو ، خەزێنەیەکی بەنرخم دیتەوە و، کاتەکەم کردە بێستانێکی بۆنخۆش و باخچەیەکی ڕازاوەی بەخشین و، سەرەنجام خەم و خەفەتیشم نەما. زۆرخۆشحالٌ بووم کە کتێبەکانم هەلٌگێر و وەرگێر دەکردن و خەریکی ڕاستکردنەوە و پوختەکردنیان بووم و، کە دەمدیت ئەو کەسانەی دەهاتنەلام ، لەمەڕ کتێبەکانم گفتوگۆیان دەگەلٌ دەکردم و، داوایان دەکرد هەندێك نووسینی خۆمیان بۆ بخوێنمەوە ، ئەوەندە خۆشحالٌ دەبووم نەبێتەوە ؛ یەکیان زیادەی دەخستەسەر ، یەك بەدلٌبوونی خۆی دەردەبڕی ، یەك سەرنجی دەخستە ڕوو ، یەك دوعای دەکرد و یەکیش ستایش ؛ کتێبەکانم لەبەرچاوم پەیامگەلی بەختەوەریی و شانازیی و خۆزگە و ئاوات و دلٌنیاییان بۆ دەناردم ، کڕنووشی سوپاسگوزاریم بۆ ئەوخوایە دەبرد، بەلاٌی کردە بەخشش و، مەینەتی کردە شادیی و، کارەساتی کردە خەلاٌت ، پاك و بێگەردیی بۆ ئەو زاتە بالاٌدەستە . کەواتە: نابێ بۆ هیچ کێشە و قەیرانێك ملکەچ بی و، هەولٌدە بۆ بەخششێکی خوایی بیگۆڕی و، بەوجۆرە ئاسوودەیی و دلٌخۆشیی و بەختەوەریت دەست دەکەوێت.

## خێراییت کەمکەوە؛پێشەوەت هەلٌقەنراوە

ئەم تابلۆیە ، کرێکارانی شارەوانیی و هاتوچۆ ، لەسەر ڕێگا گشتییەکانی دادەنێن: خێراییت کەم بکەوە؛ پێشەوەت هەلٌقەنراوە ! لەم تابلۆیە ئەوە وەردەگیرێت کە پێویستە ئێمە لەڕێگای ژیانی دنیاماندا هەست بکەین ئەم تابلۆیەمان لە پێش هەلٌواسراوە ؛ هەمیشە پێویستە خێراییت کەمکەیەوە ؛ چونکە چالٌ و چۆلٌت لەپێشن ، ئەوەش ئەو لەسەر خۆییەیە کە داوامان لێ کراوە ، چونکە تۆ ئەگەر لەمالٌێ لەسەرەخۆ نەبی ، مالٌ و مندالٌت لەقیس دەچێت و ، ئەگەر لەئیش و کارتدا لەسەرەخۆ نەبی ، برادەرەکانت دوژمنایەتیت دەکەن و، ئەگەر لەژیانتدا

لەسەرخۆ نەبی ، دۆستت لێ دەبێتە دوژمن . کەواتە:(( نەرمونیانیی لە هەر شتێکدا هەبێت ، جوانی دەکات و، لە هەر شتێکدا نەبێت ، دزێو و ناحەزی دەکات )). جا کە بە ڕێگای ژیاندا دەڕۆی ، ئاگات لەبەرد و چاڵوچۆڵ و پێچگەلی پێشەخۆت بێت و، خۆت مەخە نێو مەترسیی و قەیران و، لەسەر هەموو کێشەیەك دەگەڵ خەڵك تێك مەگیرێ ، بەڵکو لەسەرخۆ و لاشەڕ بە و بەهێمنیی هەڵسوکەوت بکە ؛ چونکە سەلامەتیی هەموو شتێك دێنێ ؛ تۆ تەماشای شوفێری کارامە و لێزان بکە ، چۆن لە ڕێگە قەڵەبالغ و تەنگەبەرەکانیشدا، سەیارەکەی بەسەلامەتیی لێدەخورێت ، بەپێچەوانەی شوفێری نەزانی سەرکێش ، کە هەموو ڕۆژێ گۆنگەڵێك دەنێتەوە و، ڕەنگە سەرەنجام خۆی و خەڵکی دیکەش بفەوتێنێ . بەسەلامەتیی بڕۆ و، بەڕێزەوە بدوێ و، سەلام و خواردن ببەخشە و، پێوەندیی خزمایەتیی بەجێ بێنە و، شەوێ کاتی ماڵ نوستنان ، نوێژێ بکە ، بەئاسوودەیی دەچییە بەهەشت.

## گوێ لەهاوڕێکەت بگرە ، دەبیە دڵنشینی

گوێگرتن لەخە ڵك هونەرێکە ، تەنها مرۆڤگەلی بەڕێز دەیزانن ، ئەمن یەکە باری خۆم ڕاهاتووم بەدرێژایی ژیانم گوێ لەو کەسەی قسەم بۆ دەکات ، بگرم ، هەرچەندە قسەکەشی پێوەندیی بەمنەوە نەبێت و، بۆشم دەرکەوتوە کە هەر ئەوەندە کەکاتێك بدەیە کەسێك بۆ گوێگرتن لەهەواڵ و قسە و باس و دەستکەوتەکانی ، یەکسەر دەچیە نێو دڵی و خۆشی دەوێی و ستایشت دەکات و، دوعات بۆ دەکات . سواری فڕۆکە دەبم و پیاوێك لەپەنام دادەنیشێت ، نایناسم و نامناسێت ، پاشان یەکتر دەناسین و دەست بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیانی دەکات و، ئەمنیش کاتی گوێ لێگرتنی دەدەمێ ، ڕەنگە لەدڵی خۆمدا (سبحان الله)م کردبێ ، تاکاتم بەفیڕۆنەڕوات ، چونکە قسەکەی پێوەندیی بە منەوە نییە ، بەلآم قسەی پێ نبڕم ، بێ ئەدەبییە و لەدەستی دەدەم و، لە ڕەوشتی مسوڵمانیش ناوەشێتەوە قسە بە خەڵك ببڕیت و بێڕێزییان پێ بکات؛ بەڵکو دڵنەوایی لە کارە چاکەکانە و، دڵڕاگرتن کارامەیی و لێزانییە.

ئی وا هەیە باسی پڕۆژەی بازرگانیی خۆیم بۆ دەکات ، کە چۆن لە سفرەوە دەستی پێکردوە ؛ هەیە باسی منداڵەکانی و زیرەکیی و چاکەیانم بۆ دەکات ، هەشە دەربارەی خوێندنی لەهەندەران و پسپۆڕییەکەی ، بابایەکی دیکە بە موحازەرەیەکی دوور و درێژ لە کێڵگە و بەروبوومەکەی ، یەکی دیکە لەبەرنامەی ڕۆژانەی و تەندروستیی و چالاکییە وەرزشییەکانی دەدوێت ، ئەمنیش بەبزەوە هەردوعا دەکەم . لەکۆتاییشدا لەو گوێگرتنە هیچ زەرەر ناکەم؛بەڵکو ڕێز و دوعا و ستایشی خەڵکم دەستدەکەوێت کە دڵنەواییم کردوون و دڵم ڕاگرتوون و، ئەوانیش بە خەیاڵی ئاسوودە و دڵخۆشیی لێم جیابوونەتەوە. گوێگرتن لە خەڵك ڕەوشت و ئاکاری خەڵکی هۆشمەند و خەسڵەتی خەڵکی مەزنە.

## دەرفەتی سەرکەوتن بە ژنەکەت بدە

لە یووتووب گرتە ڤیدیۆیەکم هەیە دەربارەی دۆزینەوەی یاسا و نهێنییەکی گرنگ ، کە بریتییە لە: (( چۆن پیاو ڕەفتار لەگەڵ ژنەکەی بکات ))، بەشێوەی گاڵتە و قسەی خۆش باسمکردوە ، بۆ ئەوەی بگاتە خەڵك و جەماوەر تێی

بگات ، ئەویش ئەوەیە کە لە کێشە و مشتومڕدا ، نابێ بەسەر ژنەکەتدا سەرکەوی و، نابێ ماسوولکان لەو فەقیرەی دەرپەڕێنی؛ بەڵکو دەبێ بەشێوازی تەسلیم بوون و بەزین خۆ دەرخەی و، داخ و خەفەت دەربڕی کە مرۆڤ نییە هەڵە نەکات و، دەبێ گوێی لێ بگری و، باسی خۆشەویستیی و مافەکانی نێوان خۆتانی بۆ بکەی ، ئیدی دەستبەجێ دێتە ڕیزی تۆ و، داوای لێبوردن دەکات و، قسەکەت قبووڵ دەکات و، کێشەکە دەبڕێتەوە و، ڕەوشەکە چاك دەبێت .

ئامۆژگاریم بۆتۆ ئەوەیە: دەرفەتی سەرکەوتن بە هاوسەرە بەڕێزەکەت بدەی ، چونکە هیچت لەکیس ناچێت ، بەڵکو دڵی وەدەست دێنی و ماڵ و منداڵ و ئاسوودەییت دەپارێزی. بەڵام تۆ بچی ئازایەتییەکی بێ وێنە نیشاندەی و، لە ماڵێ خۆتدا بیکەیە پاڵەوانبازیی و، فلیمی پاڵەوانیەتیی خەیاڵی دەربێنی ، ئەوە هەمووی بە زیانی خۆت تەواودەبێت و، لە هەموو بارێکدا هەر تێشکاوی . دەرفەتی سەرکەوتن بە ژنەکەت بدە ، ئاسوودەیی و ئارامیی و نوور و دڵخۆشیی باڵ بەسەر ماڵەکەتدا دەکێشن .

## ڕۆژەکان هەمیشە بۆتۆ نین، (بۆنە)کان هەموو بۆتۆ نین

خوای گەورە دەفەرموێ: (( **وتلك الأيام نداولها بين الناس** – ئەو ڕۆژانە لەنێو خەڵکدا دەستا و دەستیان پێ دەکەین )) **ال عمران**( ١٤٠ )... ڕۆژەکان و بۆنە و میهرەجانەکان هەمیشە بۆتۆ نین؛جاری وایە هەڵسووڕێنەری ، جاری واشە بەشداربوویەکی سادەی؛جا چاوەڕوان مەبە لە هەموو کۆڕ و دانیشتنێکدا ، بایەخت پێ بدرێت و چاوت لەسەر بن و، بارانی مەدح و سەنا و شیعری ستایشت بەسەردا ببارێنن؛ ئەوە تەنها خەیاڵپڵاوییە ! ئەگەر بۆخۆت دەمڕاست و خاوەنی کۆڕەکە بووی ، ئەوە نیعمەتی خوایە ، ئەگەر لەگەڵ بەشداربووانی دیکەش دەبوو بە کەسێکی سەرکەوتوو و دیار هەلا بلێن ، لەگەڵیان بەشدار بە و خۆت هەڵماوێرە؛ چونکە تۆ هەربەشداربوویەکی و تەواو. بەڵام هێندێك کەس بەهەڵە لەو بابەتە دەگات و، بەخەیاڵی خۆی دەبێ هەمیشە یەکەم و، لەپێشی پێشەوەی هەموو دانیشتنێك بێت ! ئەمە پێچەوانەی دەستووری خوایە لە ڕۆژ و ڕووداو و بەسەرهاتاندا؛ چونکە خوای کارزان قەزا و قەدەری خۆی لەنێو بەندەکانی ئاڵوگۆڕ دەکات؛ جارێك دەرچوونە، جارێك دەرنەچوونە، ئیدی بەو جۆرە ؛ دەوڵەمەندیی و هەژاریی ، ساغیی و نەخۆشیی ، سەرکەوتن و تێشکان .... کەواتە : واقیعیی بە و ئەگەر لە بۆنەیەکی کەسێکی دیار و بەرچاو ئامادە بووی ، بزانە کە ئەو کەسە یە لەوێ جێی بایەخە و، نابێ تیشك بخرێتە سەر تۆ ، بەڵکو دەبێ تۆ لەسێبەرێ بی . جا بێ فیز و دڵنیابە؛ چونکە نە ئەو دانیشتنە بۆتۆیە و، نە ئەو ڕۆژەش ، بەڵکو تۆ چەند ڕۆژ و بۆنەیەکت پێشتر هەبوون و، هێندێکیشت لەمەولا دەبن ... ئەگەر وا بکەی ، بەشێوەیەکی واقیعیی و بەدڵ و دەروونێکی شاد و ئاسوودە ڕەفتارلەگەڵ ژیان دەکەی.

## شتێکت پێ نەکرا وازی لێ بێنە

ماوەیەك پێش ئێستا دەستم بە خوێندنەوەی فەلسەفە کرد و ، کتێب و نامە فەلسەفەییەکانم کۆدەکردنەوە و، هۆش و بیری خۆم دەگوشی فێری زاراوە فەلسەفییەکان بم و، کاتێکی زۆرم لەدەست چوو و، سوودێکی واشم دەست نەکەوت ؛ چونکە ئەو زاراوانە دەبێ لەلای مامۆستایانی پسپۆڕ بەدەرس بخوێنرێن و، ئەمن پسپۆڕییەکەم حەدیس و ئەدەب و ئامۆژگارییە ، حەزم لە دەربڕینی ڕوون و ئاشکرایە و، وردکرنەوە و مشتومڕ لەگەڵ کەسایەتیی مندا ناگونجێت ، لەبەر ئەوە سەرەنجام گەڕامەوە سەر سروشت و مەشرەبی خۆم و، چوومەوە سەر کتێبەکانی حەدیس و مێژوو و شیعر و ئەدەب و دڵم ئاسوودە بوو و، لەوبوارەدا تێدەگەیشتم و دەرس و موحازەرەم دەگوتەوە و کتێبیم دەنووسی . کەواتە: دەبێ بەگوێرەی سروشتی خۆت رێ بکەی و، لەو بوارەی دەیزانی ، خەریکی خوێندنەوە بی و، زۆر لەدلً و دەروون و هۆش و بیری خۆت نەکەی و، بەوبابەتە قورسانە ماندوویان کەی کە ڕووحت حەزیان لێ ناکات؛ چونکە هیچت دەستناکەوێت.  بەگوێرەی سروشت و زگماکی خۆت بەرێدا برۆ و هەڵسووڕێ ، ئەنجامگەلی چاك و بەسوودت دەستگیر دەبن ، چونکە پسپۆڕیی خۆت ناسیوە ، وەکو شاعیر دەڵێ :

| | |
|---|---|
| إذا لم تستطع شيئاً فدعْهُ | وجاوِزْهُ إلى ما تستطيعُ |
| شتێکت پێ نەکرا وازی لێ بێنە | ئاواتت لەجێی دی وەدیبێنە |

## زمانت بجووڵێنە تای تەرازووت قورس دەبێت و شەیتانەکەشت کڕدەبێت

بیرم لەئیشێك کردەوە بتوانم بەئاسانیی لە کاتی ڕۆیشتن و دانیشتن و کۆبوونەوەم دەگەڵ خەڵك و، لە سەفەر و لە ماڵێ بیکەم ، هیچم نەدیتەوە وەك زکری خوا بێت . زکری خوا وەك شنەی فێنك و، ئاوی سارد و زولاڵە ، هیچ ئەرك و ماندووبوونێکی ناوێت و، لەلای خواش گەورەترین پاداشتی هەیە ، پاشان: لە کارەکەشت داتنابڕێت، بەڵکو هێز و تینی زیاترت دەداتێ و، بەسادە و ئاسانیی ئامانجت دێنێتەدی . بۆنموونە : کاتێك جلەکانت ڕێکدەخەی ، تەسبیحات بکە ؛ چونکە زمان جووڵاندن ئاسانترین جووڵە و بەسانیترین کارە ، کاتێك لە کۆڕ و دانیشتنان گوێ لە قسەی خەڵکی دەگری ، مەگەر جاروبار ، دەنا دڵت هۆشیار کەوە و هەر زمانت بجووڵێنە ، کاتێك بە خواردنەوە خەریکی ، لەنێوان پارووەکانتدا تەسبیحات بکە ، کە لە هۆڵی فرۆکەخانە چاوەڕوانی ، زۆر زکری خوای گەورە بکە ، کە دەچی بۆ ئاهەنگ و میهرەجان و بۆنەیەك ، خۆت بە یادی پەروەردگارەوە سەرقاڵ بکە ، ئەو کاتە شوێن و کات پڕدەکەی لەزکری خوای میهرەبان و، دەبیە بەختەوەرترین بەندەی خوا ، زکری خوای گەورە نەك هەر ڕێ لە کارەکانت ناگرێت ، بەڵکو بۆشت ئاسان دەکات ... چونکە نوێژ شێواز و ڕێوشوێن و کاتی خۆی هەیە و، ڕۆژوو بۆ گەلێك کەس قورسە و ، خێرکردنیش بە هەموو کەس ناکرێت ، بەڵام تەسبیحات و یادی خوای پاك و باڵادەست ، بەهەشتی خوایە بۆ دۆستانی خوا لە دنیا دانراوە ، کێ پێی خۆشە ، با بچێتە نێوی و، ڕەنج بەخەسار ئەو کەسەیە

لێی بێ بەش بێت و، بابەتەکە ، خوا بۆ ڕێکخستنە و، ئەوەی خوا تەسبیحات و زکری خۆی بۆ برِەخسێنێ ، ئەوە کلیلی فیردەوسی هەرە بالآی پێداوە. خوایەگیان ، بۆ زکر و سوپاس و چاك پەرستنی خۆت ، کۆمەکمان بکە.

## خوا جوانە و جوانیی خۆشدەوێت

خوا جوانە و جوانیی خۆشدەوێت و، پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) دایك و بابم بەقوربانی بێت – جوان و ڕێکو پێك و پاك و خاوێن و بۆنخۆش بووە و، فێری کردووین بایەخ بە ڕوخسارمان بدەین و جلی سپی لەبەربکەین و سیواك بەکاربێنین و، خۆبشۆین و نینۆکان بکەین و مووی زیادەی لەشمان لێکەینەوە و چەندان ڕێ و شوێنی دیکەی شەرعیی ، کەسەرباری قورِئان ، لەدەیان حەدیسیشدا پێ داگریی یان لەسەر کراوە . جا ئامۆژگاریت دەکەم ، وێرای چاك و پاك ڕاگرتنی ڕووحت ، دەست بە ڕوخساریشتدا بێنە ؛ بە: خۆشردن و خۆڕێکخستن و پاك و خاوێنیی و پوختیی جلك و پۆشاك و بۆنی خۆش و، قەت مەهێڵە نارِێك و شێواو بی ؛ چونکە تۆ نوێنەری ئیسلامی و بەندەی خوای و بە چاکترین شێوە دروستی کردووی ، کەواتە: ئەو جوانیی و ڕێکوپێکییەی خوا پێی داوی ، تێکی مەدە و مەیگۆڕە بۆ قیافەیەکی نارِێك و شەپرێو و ناحەز و، بەردەوام خۆ بشۆ و دوای خواردن دەم و ددانت پاك کەوە و، سیواك و فڵچە بەکاربێنە و عەتر و بۆنی خۆش لە خۆت دە و، با لەنێوان ماڵێ و لەنێو برادەر و هاورِێیانت هەمیشە بۆنخۆش بی ، بۆ ئەوەی بۆ خەڵك مایەی ئاسوودەیی و خۆشحاڵیی بی .

بێگومان خوا پاك و جوانە و، شتی پاك و جوانی خۆشدەوێت و، ڕوخسار و شێوەی بەندەکانی پاك و جوان کردوە و ، بە جوانترین شێوە دروستی کردوون ، جا تۆش بە بۆچوونی خراپ و خوار و خێچ پێچەوانەی ئەم ڕێوشوێنە مەبە ، وابزانی دنیا بەکەمگریی بریتییە لە پیس و پەلۆسیی و گوێ بەخۆ نەدان و خۆ ئازاردان ! چونکە دنیا بەکەمگریی ، پاکوخاوێنیی و سادەیی و لەسەرەخۆیی و بێفیزییە ، وێرای شوێنکەوتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**)... خوای گەورەش دەفەرموێ : (( **ولقد كرمنا بني أدم** – بێگومان ئێمە ڕێزمان لە بنیادەم گرتووە )) **الإسراء** (٧٠)... هەڵبەت بەشێکیش لە ڕێزگرتنی بنیادەم لەلایەن خواوە ، ئەوەیە کە ڕوخسار و شێوەی جوانکردوە و، خەملاندن و داهێنانی تێدا کردوە و، دەرو دەروونی چاك و بەرچاو دروستکردوە.

## بەسوودی گشتییەوە خەریك بەو مەچۆ نێو قسەی بێ هوودە و بێ سەروپا

دوو مامۆستای بەرِێز ، کە خۆیان بۆ کاری خۆبەخشانە و سوودی گشتیی و، بەرنامەگەلی بەسوود بۆ تێکرای مسوڵمانان و، بەشداریی سەرپەرشتیکردنی هەتیوان و، خێرکردن بە هەژاران و چارەسەری نەخۆشان و شتی لەم بابەتە ، یەکلا کردبۆوە ، سەردانیان کردم ، هەتا دەمدیتن ، پرِۆژەیەکی تازەیان پێ بوو؛ دوا پرِۆژەشیان؛ پرِۆژەی چارەسەرکردنی نابینایان و هاوئاهەنگیی دەگەڵ پزیشکانی چاو بوو ، بۆ پێکهێنانی کەمپینێك بۆ ئەم کارە

لەجیهانی مسوڵمانئشیندا. کات لەکن وان پیرۆز بوو و ، بەشی ڕق بەرقەی نەیاران و قسەی بێ سەروپا و مشتومڕی نەدەکرد ؛ چونکە ئەوەی خۆی بەئیشەوە سەرقاڵ کات ، خوا لەتەنبەڵیی و کەمووکورتیی و هەڵخلیسکان و دم بەدمە دەیپارێزێت . لەبەر ئەوە دەڵێم : ئەگەر دەتەوێ کاتت وەبەربێنی ، وەرە مەیدان و سوود بە خەڵك بگەیەنە و، لەو شوێنە هەستیارانە نزیك مەبەوە ، قسەی بێهوودەیان لێ دەکرێت و، مشتومڕ و ناکۆکییان تێدایە ، دەنا تەمەن و خێروچاکەت بەزایە دەچێت و، هۆش و بیرت دەشێوێت و، ئاسوودەییت نامێنێ . هەمیشە بەدوای کاری بەسوودا بگەڕێ و، یان لە کارێکی خۆبەخشانە ، یان کارێکی خێری کۆمەڵایەتیی ، یان کارێك سوودی گشتیی مسوڵمانانی تێدابێت ، بەشداربە ، خوا تەندروستیی و ئایین و ماڵ و منداڵت دەپارێزێ و، ڕاستەڕێ و سەرکەوتووت دەکات ؛ چونکە ڕێگەی ڕەزامەندیی و دۆستایەتیی خوات گرتۆتەبەر و، خواش پشتی دۆستانی خۆی بەرنادات .

لەبەر ئەوە شتێکی عاقڵانە و بەجێیە کە تەمەنی خۆت لەو شتانەدا بەریە سەر ، کەلەخوات نزیك دەخەنەوە و ، تەنها چاکە لەگەڵ خەڵك بکەی و، بەو ڕێگایە هەموو کاتی خۆت بۆ دەبێتە سوود و قازانج و، دڵخۆش و بەختەوەر و تەمەن درێژ دەبی و، کردەوەی چاکت زۆر دەبێت و، خوا لە گوناحەکانت خۆشدەبێت. چاکە بکە و لە خراپە دوورکەوە ، (( **من حسن اسلام المرء ترکه مالا یعنیه** – بەشێك لە ئیسلام چاکیی مرۆڤ ئەوەیە خۆی لەشتێك هەڵنەقورتێنێ کە پەیوەندیی پێوە نییە )) **رواه الترمذي** ( ٢٣١٨ ) ، هەرکەسێك کاتی خۆی بەشێوەیەکی هەق و ڕاست بەکاربێنێ ، خوا لە ناهەق و خراپە دەیپارێزێت و، هەرکەسێك خوای میهرەبان ڕازیی کات ، لە شەیتان دەیپارێزێت.

## لەتیۆربازیی دوورکەوە و وەرە مەیدانی ئیش کردن

ئەو بیردۆزەوانانەی شارەزای زانستی کەلام و مشتومڕن ، زۆربەیان قسەیان زۆر و کرداریان کەمە ؛ چونکە بەردەوام لە کۆڕو دانیشتنەکانی قسەو گفتوگۆ و مشتومڕ و، بەرپەرچدانەوە ، کەوتوونەتەوە و، تەمەنیان هەموو دەڕوات و وادەزانن بیردۆزە و چوارچێوە بۆ کارکردن دادەنێن ، کە چی هەموو کاتیان بەتیۆر و بەرنامەدانان دەڕوات و، ئەرك و ماندووبوونیان بەفیڕۆ دەچێت و هیچ بەهیچ ناکەن ! ئایا کۆڕ و دانیشتنی هاوەڵان بۆ تیۆر و چوارچێوە دانان بووە – وەکو ئەوانە دەڵێن – یان بۆ فێربوونی زانستی بەسوود بووە ، بۆ ئەوەی دوای فێربوون بچنە مەیدان و یەکسەر بیخەنەکار ؟! ئەوەندە زانستە وەرگرە پێت دەکرێتە کردار و، ئەوەی دەیبیستی و دەیخوێنیەوە ، جێبەجێی کە ، بەڵام ئەو زانستەی پێوەندیی بە واقیع و ژیانەوە نییە ، وەکو: زانستی کەلام و بەشی زۆری فەلسەفە و ئەوشتانە ، بێ سوودن ئەگەر خەریکی ئاوەدانکردنەوەی دنیا بین و، ئەو زانستەی هەمانە ، خستمانە کار ، ئەوە دەبێتە خێر و بەرەکەتێکی زۆر و بەردەوام ، بەڵام کێشە ئەوەیە زۆرکەس بەبیانووی بەرنامە و تیۆرسازیی بۆ بانگەواز و کاری ئیسلامیی و توێژینەوەی پێشهاتە تازەکان ، خەریکی شەو نخوونییە ، بەڵام لەهەردووك جەژن دەبن ؛هەم کاتیان بەخۆڕایی دەڕوات ، هەم هەوڵ و ماندووبوون. براینە ، لە فێربوونی زانست و ئیشکردندا سادە و

ساكار بن و، بەتەما بەرەكەتی خوا بكەونەئیش و، زەمانە پڕكەن لە كەڵك و سوود و، ئەوەندە زانستە فێربن ، كە دەكرێ بخرێتە بواری جێبەجێكردنەوە . سەركەوتنیش هەر لەخواوەیە .

## بابای گەشبین ڕۆزیی و سەركەوتنی بەسەردا دەبارێت

دووبارە (**كتاب السر**) م خوێندەوە و پێشتر لەوتارێكدا لەهەندێك بوارەوە ڕەخنەم لێ گرتبوو ، بەڵام لەوەدا لەگەڵی كۆكم كە گەشبینیی ڕێگەی دەرچوون و سەركەوتنە و، تۆ بۆ خۆت چۆن دەخۆڕا دەبینی ، لەنێوبازنەی زانست و خواشدا هەر وا دەردەچی و، گومانت لەمەڕ پەروەردگارت چۆنە ، پەروەردگارت بەپێی ئەو گومانەت دەبێت ، وەكو لە حەدیسدا هاتوە : (( **أنا عند ظن عبدي بي ، فليظن بي كما يشاء** – گومانی بەندەكەم دەربارەی من چۆن بێت ، من ئاوا دەبم ، جا چۆنی پێ خۆشە ، با گومانی دەربارەی من وا بێت )) **رواه مسلم** . ئەگەر گەشبین و چاوەڕوانی خێر و چاكەبووی ، بە ئیزنی خوا تووشی خێر و خۆشیی و ڕۆزیی و سەركەوتن دەبی ، ڕەشبینی نا ئومێدیش ، بەپێی بۆ چوونی خۆی ناخۆشیی و نەگبەتیی و خەم و شكستی تووش دەبێت ... بۆیە هەندێك فەیلەسووفی ڕۆژئاوا دەڵێن : ئەگەر لەو باوەڕە دابووی كە سەردەكەوی ، ڕاست دەكەی ، ئەگەر واشت زانی سەرناكەوی ، هەر ڕاست دەكەی . بۆیە گۆڕینی نیاز و گومان بۆ باشترین و جوانترین بابەت ، بنەڕەتێكی ئیسلامییە و ، پێغەمبەر (د.خ) حەزی لە گەشبینیی و پێشبینیی چاك كردوە. كەواتە باوەڕی پتەو و گومانی چاكت بە خوا هەبێت و، پێشبینیی پاشەڕۆژێكی گەش و داهاتوویەكی جوان بكە و، بە خۆت بڵێ كە سەردەكەوی و زەفەر بەكێشەكان دەبەی و بێ ڕۆزیی نابی و، ڕێگەكانی بەردەمت بەرەو سەركەوتنی دنیا و دوارۆژ ، تەخت و كراوەن و، بەم جۆرە گیان و دەروونت دەگەڵ دەستووری ژیان هاوئاهەنگ دەبێت و، لە بوارەكانی كاروكاسپیی و زانستدا دەكەویە گەڕ و، دەگەیە بەرزترین پلە و پایە ؛ چونكە تۆ بیروبۆچوونی جوان و كاری بنیاتنەرانەت لێك گرێ داون . بابای سەركەوتوو، نیشانەكەی ، گەشبینیی و گومانی چاك بردن بە خوا و پێشبینی كردنی شتی هەرە جوان و هەرە تەواوە ، بەڵام بێ ئومێدی تێشكاو، نیشانەكەی ، بەدگومانیی و ڕەشبینیی و، دیتنی لایەنی خراپی شتەكانە . هیمەت بەرز بە و پشت بە پەروەردگارت ببەستە و، متمانەت بە خۆت بێت و، خۆت بەخوا بسپێرە.

## چاوپۆشیی و ئاشتەوایی بكە و دانوێنە ؛چونكە ژیان كورتە

لە (ئەدیس ئەبابا)ی (ئەسیووبیا) ، لەگەڵ برادەرەكانم سەردانی (د.يحيى الهنيدي)مان كرد ، دیتمان بانگخوازەكان سەرباری میهرەبانیی و خۆش مەشرەبییان ، پێكەوە ناكۆكن و نێوانیان ناخۆشە و، ئێمەش دەستمان بە پێكهێنانەوەیان كرد ، تەماشامان كردن ، زۆر لێك نزیكن و سەرەنجام پێكهاتنەوە . دەستیان بەسەردانی یەك كرد و، لەبەردەمی ئێمە ئامێزیان لێك دەدا و دەگریان ، پاشان بەخۆشیی پێكەوە دادەنیشتن وەكو هیچ نەبووبێت و، لەنێوخۆیاندا دەستیان بە بیركردنەوە لەپڕۆژەی بانگەواز كرد. بەڕاستیی دڵسافیی و چاكەخوازیی و زوو لێك خۆشبوونیان ، سەرسامیان كردم . ... هەندێك خێزانی لای خۆمانم بیركەوتنەوە ، كە لەسەر چەند مەسەلەیەكی

زۆر بچووكی دنیایی ، نێوانیان تێكچوو و دوژمنایەتیان لێ پەیدا بوو ، زیاتر لە چل ساڵ نەیاری یەكدی بوون و سەلامیان لێك نەدەكرد ! زانیم مەسەلەكە دڵە و، هەركەسێك خوا دڵێكی ساف و، گیانێكی پاكی لێخۆشبووی تەبای لاشەڕی پێ بەخشیبێت ، بەئارام و ئاسوودەیی دەژیت و، بۆ سەر هەق دەگەڕێتەوە و، خۆی لە خەمی دوژمنایەتیی و كێشەی دووبەرەكیی و، گیانی تۆڵەكردنەوە لە بەندەكانی خوا ، ئاسوودە دەكات .. چاوپۆشیی بكە و ئاشت بەوە ؛ چونكە ژیان كورتە و، ڕۆژگار زوو تێدەپەڕێت و، زۆر نابا دەچینە لای خوای پەنهانزان تا لەسەر كردەوەكانمان لێپرسینەوەمان دەگەڵ بكات ، جا نەكەی بەجۆرێك بچیە خزمەت خوا كە بەینت دەگەڵ بەندەكانی خوا نەبێت ، یان دوژمنایەتیی و غەیبەتت كردبن، یان مافت لێ زەوت كردبن ... خوایەگیان لە ئێمە و خوشك و برایانی مسوڵمانمان خۆش بە ...

## خەڵك بەختەوەركە بەختەوەر دەبی

لە سعوودیە و دەرەوەی سعوودیە ، سەردانی كۆمەڵە خێرخواز و خۆبەخشەكانم كردوە ، تەماشامكردوە ئەو كەسانەی پێیان هەڵدەستن و بەڕێوەیان دەبەن ، هەر خوا دەزانێ چەندە گورج و گۆڵ و شاد و خەیاڵ ئاسوودەن ، چونكە خوا قەرەبووی ئەو كەسانەی خێر و چاكە دەگەڵ خەڵك دەكەن ، دەكاتەوە و، هەركەسێك سەرپەرشتیی هەژاران و بێوەژنان و هەتیوان بكات، سەرباری ئەو پاداشتە زۆرەی خوای گەورە بۆی هەڵگرتوە ، دڵیشی پڕ لە ئارامیی و ئاسوودەیی و خۆشیی و شادیی دەكات . زۆر كەسیشم دیوە هەر بۆ خۆی و بازرگانیی خۆی دەژی و، بەردەوام لە دڵتەنگیی و خەم و خەفەتدایە ؛ چونكە بە خۆپەرستیی و، دەست پێوەگرتنێكی سەیری سامانەكەی ، هەر بۆخۆی دەژیت ، جا سەرباری ئەوەی خوا لەسەر كەمتەرخەمیی دەرهەق بەندەكانی ، لێی دەپرسێتەوە ، لە دنیاشدا سزایەكی پڕ بە پێستی دەدات و ژیانی پڕ لە خەم و خەفەت دەكات . جا ئەگەر ویستت دڵخۆش و بەختەوەربی ، بەتەما بەرەكەتی خوا بكەوە كار و، سەرپەرشتیی هەتیو و بێوەژن و هەژاران بكە و، خێرو چاكە بكە ،دێتەوە ڕێت و، تۆوی سوود و چاكە بچێنە ، بەری پاداشت و خۆشیی و بەختەوەریی و ڕووناكیی دەدروویەوە.

## بە بەرنامەیەكی تۆكمەی ڕۆژانە خوا حافیزیی لەخەمان بكە

چەندەها خەڵكم ناسیوە و، چوومەتە نێو برادەرانی جۆراو جۆر و، سەفەرم بۆ گەلێك وڵات كردوە ، بۆم دەركەوتوە ئەوەی بەرنامەیەكی تۆكمە و ڕێكی ڕۆژانەی هەبێت ؛ بە نوێژی بەیانی دەست پێبكات و، مافی خۆی بداتە ئیش كردن و پشوودان و نوستن و، مافی ماڵ و خێزان و خزم و برادەران بەجێ بێنێ ، بەشادیی و دڵخۆشیی و بەختەوەریی دەژیت ؛ چونكە كاتی خۆی بەگوێرەی سیستەمی ژیان و دەستووری خوا ، كە مرۆڤی لەسەر دروستكردوە ، ڕێكخستوە . دیتووشمە هەر كەسێك بەگوێرەی بارودۆخ بژیت و، كات و ئەركی ناڕێك و پرژ و بڵاو بن ، بەردەوام لە خەم و خەفەت و ناخۆشیدایە ... چونكە هەندێك كەس بەگوێرەی ڕووداوە كتوپڕەكان دەژیت و،

گوێ ناداتە نوێژکردن لە کاتی خۆیدا و، ئیشەکەی هیچ بەرهەمێکی نییە و، پێی خۆش نییە مەوعیدەکانی بەجێ بێنێ ... هەموو ئیشەکانی بەپێی هەڵکەوتن و، پشت بە پێشبینیی دەبەستێت و، هەر کە شتێك هاتە پێشێ ، ئەو جار ئەنجامی دەدات ... جا زۆر ئاگات لەو بابەتە بێت ؛ چونکە بێسەروبەرەیی ڕێگەیەکی فرەوانە بۆ هاتنی خەم و خەفەت و ناخۆشیی . کەواتە: ئیشی خۆت قایم بگرە و بەرنامە بۆ ژیانت دانێ و، با هەموو ڕۆژێ بەرنامەیەکی دیاریکراوت هەبێ ، بەخۆشیی و ئاسانیی جێبەجێی بکەی ، ئەو کاتە ژیانت پڕ دەبێ لە خۆشیی و بەختەوەریی و ئاسوودەیی .

## دوای خانەنشینیی ، زۆر خەفەتی خوارد، پاشان چارەسەرێکی دۆزییەوە

ئەفسەرێکی سوپا دەناسم ، خانەنشین کرا ، ئەویش گۆشەگیر بوو و ، خۆی لە کۆمەڵ دابڕی ، سەرەنجام تووشی خەمۆکیی بوو و، وای لێهات ماوەیەك تووشی شەکرە بوو ... پاشان بەبیریداهات کە بچێتە قەراغ شاری (تائیف) ی حیجاز و، لەوێ کێڵگەیەکی کڕی و خانوویێکی دروستکرد و، دەستی بە پیادەڕۆیی و وەرزش و چێژوەرگرتن لە سروشت کرد. دوای دوو ساڵان برادەرێکم لە شوێنە تازەکەی سەردانی کرد ، تەماشای کرد بەدڵخۆشیی لەنێو کێڵگەکەیدایە و، ساغ و سەلامەتە و لەو پەڕی خۆشیدایە؛ لەمەڕ بەرنامەی ڕۆژانەی پرسیاری لێ کرد ، گوتی : بەیانیان زوو پێش بەرەبەیان هەڵدەستم نوێژی وەتر دەکەم و چاوەڕێی نوێژی بەیانی دەکەم ، دوایی دەگەڵ ماڵ و خێزانم نوێژی بەیانی دەکەم ، پاشان ئەوەندەی کرا قورئان دەخوێنم ، دوای ئەوە هەندێك ( **رياض الصالحين**)ی ( ئیمامی نەوەویی) دەخوێنمەوە ، پاشان هەندێك پیادەڕۆیی دەکەم و، نانی بەیانی دەخۆم و دەچمە نوسینگەکەم .... باسی دەکرد چۆن کاتی نوێژەکانی ڕێکخستوە و هەست بەخۆشیی و ئاسوودەیی دەکات و، ژیانێکی نوێی دەست پێکردوە ، ئەوەندە خۆش و بەچێژە ، لە ژیانیدا نەیدیوە. بێگومان بەرنامە دانان بۆ ژیان و چوون بۆ نێو سروشت و بەردەوامبوون لەسەر پیادەڕۆیی و نوێژکردن لە کاتی خۆیدا و، قورئان خوێندن بەوردیی و زکری زۆر ، ڕێگای گەیشتن بەخۆشیی و بەختەوەرین. بەڵام گۆشەگیریی بەبێ زانست و وەرزش و خواپەرستیی و خۆدابڕینی بێ بەرهەم لە ژیان ، ڕێگەی گەیشتنن بە خەمۆکیی و خەم و خەفەت و ناخۆشیی . ئێستا ڕێگاکەت پێ زانی؛ کەواتە گیانت قوتار کە و، وەك ئەو باڵندە بە لەنێو باغ دەخوێنێ؛ پیادەڕۆیی بکە ، بخوێنەوە ، زکر بکە ، بیربکەوە ، بنووسە ، گرنگ ئەوەیە گۆشەگیر و بێ ئیش و بێ بەرهەم نەبی.

## شوانێك لە ملیاردێرێك بەختەوەرترە !

پیرە پیاوێك دەناسم تەمەنی نزیکەی سەت ساڵ دەبێ ، باوەڕ بکەن ، لە گوندێك شوانی مەڕانە و سەرقاڵی زکری خوایە ، هەرگیز نەچۆتە خەستەخانە و، هیچ داوودەرمانێکی بەکارنەهێناوە ، بەڵکو خواردنێکی سادە و ساکاری خۆی ، کە نان و شیر و ئەو شتانەیە ، دەخوات. بە شاخان هەڵدەگەڕێ و دادەگەڕێتە دۆڵان، لە شێکی تێکسمڕاو و ڕێك و ماسوولکە دەرپەڕیوی هەیە و بەردەوام خۆشحاڵە و هەتا دیتبم ، لەگەڵم پێکەنیوە ... واهەست دەکات

بەختەوەریی لە هەموولاوە داپیۆشیوە؛ خەمی بەیانی ناخوات ، قەناعەتی بە ڕۆزیی ئەمڕۆیی هەیە و، خۆی لە ئیشی خەڵك هەڵناقورتێنێ؛ نوێژ و خواپەرستی خۆی دەكات و، بە چاكە نەبێ ، هەقی خەڵكی نییە. لە بەرانبەریشدا ملیاردێرێك دەناسم ، لەڕادەبەدەر هەبووە؛ تەنانەت چەندان فڕۆكەی تایبەتیی و چەندان وتێل و خانوو و كۆشك و تەلار و چەندەها شتی دیكەشی هەیە، بەڵام لەو پەڕی دڵتەنگیی و نیگەرانیدایە و، بەردەوام دەرمانی هێوركەرەوە و شتی لەو بابەتە بەكاردێنێ ! جا با قەت ئەو دوو نموونەت لەبیر نەچن ؛ ئەمن بەچاوی خۆم هەردووكم دیتوون و سەرم لێ سوڕماون .

## نوێژ و قوڕئان و زكری خوا و قەناعەت پەیژەن بۆ بەختەوەریی

مامۆستا محمد ابراهیم ، كە خەڵكی بۆرمایە و لە مەككە دەژی و دراوسێی كەعبەیە ، بۆی گێڕامەوە كە كابرایەكی خەڵكی یەمەن ، كە یەكە لە پیاوچاكە خواپەرستەكان و تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێپەڕیوە ، بەردەوام لە ماڵی خوایە و، بۆ كاری زۆر پێویست نەبێ ، ناچێتە دەرێ ... دڵكراوە و خۆشحاڵ و جل و پۆشاك پاكە ، نوێژەكانی بەرێكوپێكیی دەكات و بەبیركردنەوە و وردیی قوڕئان دەخوێنێ و، زۆر زكری خوا دەكات و، بە ئیشی دەستی خۆی دەژیت و، خێر و بەخشش لە كەس وەرناگرێت . ئەو پیاوە دەڵێ : نە دنیای لەبیرە نە ئەو خەڵكەی تێیدایە و، ڕووی لە پەروەردگاری خۆیەتی و، لەبەرئەوەی بەیانی و ئێواران بەرانبەر ماڵی خوا كڕنووش بۆ خوا دەبات ، لە هەموو كاتێك خۆشحاڵ و بەختەوەرترە. ئەو مامۆستایە ، بەردەوام باسی ئەو خواناسە یەمەنییەم بۆ دەكات ، ئەمنیش بەردەوام لەبارەیەوە پرسیاری لێ دەكەم ، كە ناوەناوە ون دەبێت و دەچێتە مزگەوتی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وسلم)** لە مەدینە. سەرم لەو پیرەمێردە خواناسەی یەمەن سوڕمابوو ، كە چۆن ژیانی ئەم دنیایەی ، بە هەموو گاڵتە و گەپ و تەفرەدانیەوە ، كورت كردۆتەوە و، توانیویەتی خۆشترین ژیانی سەرزەویی بۆ خۆی دابین بكات ، كە بریتییە لە: ڕازیی بوون بە كاری خوا ، قەناعەت بە بەشی خوا و، پەرستنی خوا و، قوڕئان خوێندن و، زۆر یادكردنی خوا ؛ چونكە ئەوە لە خواوەیە و بۆ خوایە و دەگەڵ خوایە و لە پێناوی خوایە.

## بازرگانێكی مسوڵمانی هیندیی ڕێی دنیا و دوارۆژی دۆزیوەتەوە

لەگەڵ برادەرێكم ، كە شۆفێرمە، بەڕێز (تۆفیق جمال الدين)ی سریلانكیی ، چوومە سریلانكا ، هەندێك قوتابی زانستی لێ بوون ، ئەو وڵاتە لە وڵاتە هەرە جوانەكانی خوایە لەسەر زەوی؛ پڕە لە كێڵگەی چا و مۆز و، تاڤگە و ڕووبار و، گوڵ و گوڵزار و دارستان و بەروبووم ، كە بە تەواویی جێدەستی وەدیهێنەری هونەرمەندیان پێوە دیارە. سپەینان دەچوومە دەرێ؛ تەماشای شاخ و گرد و تەپۆلكە و لاپاڵی شاخانم دەكرد، هەموویان بە زمانی حاڵ لە گەورەی و زانای خوا دەدوان، وەكو دەربارەی گەورەی وەدیهێنەر دەرس بڵێنەوە؛ دەتگوت گوڵ قسەم دەگەڵ دەكات و، كولۆوك و مۆز و نەعناو قەنەفڵ و ڕێحانە و...... هتد، باسی شاكارەكانی دەستی خوای باڵا دەست دەكەن... بەنێو ئەو گردە سەوز و، باخچە ڕازاوە و، بێستانە دڵگیرانەدا دەڕۆیشتم، دڵم دەكرایەوە و، پڕدەبوو لە خۆشیی و

شادیی و، بۆم دەركەوت خوای گەورە ئەو شتانەی دروستكردوون، تا چاو و دڵمان ڕوونكەنەوەو،خۆشیی و شادیمان پێ ببەخشن و، بۆ گەیشتن بە خوای زانای میهرەبان، بۆمان ببنە ڕابەر؛ جا ئەگەر دڵت تەنگ بوو، بڕۆ دەر و دەشت و، تەماشای شاخ و دۆڵ و گرد و بەرزایی و باغ و بێستان و شینایی بكە؛ چونكە باسی خوات بۆ دەكەن، لە ژوورەكەت مەمێنەوە، داڵغە لێبدەی و بیرەوەرییە خەماوییەكانی كۆن وەبیر خۆت بێنیەوە ((**قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ – پێیان بڵێ:تێفكرن وبزانن ئاسمانەكان و زەویی چییان تێدایە!**)). **یونس** (١٠١).

## تەنها شتی حەڵاڵ و پاك بخۆ و تەنها كاری چاك بكە

كاتێك سەردانی چینم كرد، سوپاسی خوام كرد كە موسڵمانم ؛چونكە لەوێ هەرچی بەسەر زەویدا بڕوات دەیخۆن؛ تەنانەت جارێك بە گاڵتە لە موسوڵمانێكی چینیمان پرسی: ئەرێ لەلای چینییەكان چ خواردنێك حەرامە ؟ گوتی:چینییەكان هەرچی بە ئاسماندا بفڕێت، دەیخۆن؛ بێجگە لە فڕۆكە و، هەرچی بەسەر زەویشدا بڕوات ، دەیخۆن؛ بێجگە لە سەیارە ! دەماندیتن دووپشك و مار و سەگ و پشیلە و هەمووشتێك دەخۆن . پاشان گەڕاینەوە نێو موسوڵمانەكان، لە شاری (كوانزۆ) ی ویلایەتی (لانگۆ)، ئەوان چێشتخانەگەلی تایبەتییان هەبوون بە ناوی (چێشتخانەكانی خواردنی حەڵاڵ لەسەر ڕێبازی ئیسلام)... خوای گەورە دەفەرموێ: ((**وَ يُحِلُّ لَهُمْ الطَّيِّبَاتِ وَ يُحَرِّمُ عَلَيمَ الخَبَائِث – شتی چاك وبەسوودیان بۆ حەڵاڵ دەكات و، شتی پیس و زیانبەخشیشیان لێ حەرام دەكات**)) **الأعراف** (٥٧)... جا ئەوە بكە بە پێوەر و، لە شتی زیانبەخش، با حەڵاڵیش بێت، وەكو حەلوا و شیرینیی و چەوریی و شتی لەم بابەتە دەبێ كەم بكەیەوە. بەردەوام چاكە بكە؛ چونكە خوای گەورە دەفەرموێ :((**يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا – ئەی پێغەمبەرینە، لە شتی چاك و پاك بخۆن و كردەوەی چاك ئەنجام بدەن**)) **المؤمنون** (٥١) ، خوا ئەو فەرمانەی بە تێكڕای مسوڵمانانیش كردوە؛ مەبەستم ئەوەیە كە پێویستە هەر شتێك خوا حەرامی كردبێت، دەبێ لێی وەدووركەوین؛ چونكە خوا شتی چاك و بەسوودی بۆ حەڵاڵ كردووین و، شتی پیس و زیانبەخشی لێ حەرام كردووین و، میهرەبانیی دەگەڵ كردووین و، شتە سوودبەخش و زیانبەخشەكانی بۆ لێك كردووینەوە. جا هەر شتێك دەخۆی، دەبەر دەكەی، یان دەكەی، ئەم بنەڕەتەت لەبیربێت؛ چونكە ئیسلام بۆ دنیا و دوارۆژی مرۆڤ ڕەحمەتە و، هاتوە لە دنیا و قیامەت بەختەوەری كات. كەواتە: لەسەر ئایینە مەزنەكەت و لەسەر ئەوەی بۆ سەر ڕێی ڕاست ڕێنوێنیی كردووی، سوپاسی خوا بكە و، شتی پاك و چاك بخۆ و كردەوەی چاك بكە و، بایەخ بە تەندروستیی و ڕۆژیت بدە و، زێدەڕۆیی مەكە؛ چونكە ئایینی خوا نێوەنجییە و لەنێوان پەڕگیریی و كەمتەرخەمیدایە.

## ژیانێکی دووبارەی ڕۆتینی بێ هیچ شتێکی تازە

دووجار لە شاری (میوونیخ )ی ئەڵمانیا، نزیکەی سێ مانگ ماومەتەوە؛ بۆ چارەسەری چۆکان دەچووم و، پرسیارم لە پزیشکان و مامۆستایان دەکرد دەربارەی ژیانیان لە ئەڵمانیا، تەماشام کرد هەمووی یەك بەرنامەیە؛ ڕاکەڕاکێکی بەردەوام لە ژیاندا : دەوام، پاشان نوستن، پاشان دەوام ، دوایی مۆڵەت و بەم جۆرە ... لەو نێوانەدا نە نوێژێك هەیە، نە قورئان خوێندنێك، نە تێڕامانی گەردوون نە زکر و نە تۆبە و نە داوای لێخۆشبوون و، بەرنامەکە نە پێوەندیی خزمایەتیی و سەردانی نەخۆش و تەمای پاداشت و بەڕێکردنی جەنازە و سەردانی گۆڕستان و دوعاکردن بۆ مردوانی تێدایە، نە ئەو لیستە دوورو درێژە پاکەی لە ئیسلامدا هەیە.  ژیانیان هەمووی لە کارکردن و فەرمانبەریدا کورت هەڵاتوە، مرۆڤ هەر دەڵێی ئامێرێکە لە کارگەدا دەجووڵێت؛ ئەوە ڕۆژی یەکشەممە دەیان ساڵە بە شێوەیەکی ڕۆتینیی مۆڵەت و پشووە و، دەوامی بەیانیان و کۆتایی هاتنی دەوام لە کاتی خۆیدایە و دواناکەوێ و، هیچ نێوبڕێکی پشووی تێدا نییە گیان ببووژێنێتەوە و، شێوازی دووبارەی ڕۆتینی تاقەت پڕوکێنی پڕ لە دەنگە دەنگی ژیان بگوڕێت. کاتێك گەڕامەوە نیشتمان ، دیتم لێرە لەگەڵ ئیش و کار و فەرمان، پێنج نوێژمان هەن، وێڕای تێڕامانی کتێبی خوا و، چاکە دەگەڵ دایك وباب و سەردانی خزمان و بەشداریی لە کاری خۆبەخشانە و، چەندان کردەوەی چاکی دیکە ، کە مسوڵمان دەتوانێ لە شەو و ڕۆژدا ئەنجامیان بدات . سوپاس بۆ خوا کە بە کاری چاکە و خێری جۆراو جۆر، کە سەرپاکیان پاداشت و خێر و خۆشیی دنیا و دواڕۆژیان تێدایە، بەردەوام ژیانمان تازە دەکاتەوە.

## ژیانێك سەرپاکی ژاوەژاو و هەراو بێنەوبەردەیە

بە مەبەستی بانگەواز، چەند ڕۆژێك لە مەڵبەندی ئیسلامیی (هۆنگ کۆنگ) مامەوە و، سەردانی شوێنە ناسراو و بەرچاوەکانی شارەکەم کرد؛ دیتم خەڵکەکەی دەتگوت لەنێو کارگە، یان شەمەندەفەردان، بەردەوام ئیش دەکەن و لەنێو هەرا و ژاوەژاو و بێنەوبەردە و قەڵەباڵغیدان و،خەڵکەکە بوونەتە شتێکی وەکو ئامێر! دەبینی لە چێشتخانە و بانك و فرۆکەخانە و بازاڕ، لە ڕیزی دوور و درێژدا ڕاوەستاون و، هیچ کاتیان بۆ ڕووح نییە ، نە نوێژ هەیە، نە خواپەرستیی، نە دانیشتنێك بۆ لەخۆ پرسینەوە، نە زکری خوای گەورە، تەنانەت کارێکی خۆبەخشانەش نییە، تەمای پاداشتی خوایان پێ بێت؛ هەر کەس بە خۆیەوە سەرقاڵە، مرۆڤ هەر دەڵێی میلی سەعاتە لە سوڕانەوەی بەردەوام و ڕۆتینیدایە. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ماوەیەکی زۆر لەکن ئەوانە وەمێنم، تووشی داڕووخان و نائومێدیی دەبم ! لەوێ سەرباری ئەو هەموو شەمەندەفەرە پێشکەوتوو و کۆشکە سەر لەهەور دەر و بازاڕە فراوان و چێشتخانە پێشکەوتووانە، ڕووح بە تەواویی هاڕراوە و لەنێو چووە، لەبەرئەوە پڕ بووە لە ڕەشبینیی و نیگەرانیی و دڵتەنگیی و ڕووداوگەلی خۆکوشتن . لەکن وان قەت ڕووح هیچ خۆراکێکی خواپەرستیی و قورئان خوێندن و زکر و نۆبەی نادرێتێ و، هەرچی هەیانە، لەپێناوی لەشیاندایە و، ئەوەش هەڵەیەکی ڕیشەییە لە ژیانیاندا .

## پێبكەنە و قسەی خۆش بكە و تێكەڵاوی خەڵك بە ، خۆشیان دەوێی

لە مزگەوتی گەورەی (جاكارتا) ی (ئەندەنووسیا) نوێژم كرد، زۆر ماندوو بووم و تازە لە موحازەرە بووبوومەوە... كە سەلامم دایەوە، مسوڵمانان هەستان و بەخێرهاتنێكی گەرم و گوڕیان كردم؛ چونكە لە مەكە و مەدینەوە هاتبووم . لە دڵی خۆمدا گوتم: ڕەنگە ئەمە یەكەم دەرفەت و دوا دەرفەت بێ، ئەم مسوڵمانە چاكانە ببینم، كە بێ هیچ بەرژەوەندییەكی ماددیی و هەر لەبەر خوای گەورە، ئاوا بە دێرو جوانەوە بۆ بەخێرهێنانم كۆبوونەتەوە، بۆیە لە جێی خۆم ڕاوەستام و، بەپێكەنینەوە سەلامم لێ دەكردن و تۆقەم دەگەڵ دەكردن و، هەندێكیان ماچیشیان دەكردم و، دوعایان بۆ دەكردم و، ئەمنیش دوعام بۆ دەكردن و، زیاتر لە سەعاتێكی خایاند تا لە مزگەوتێ چوومە دەرێ و، هیچ هەستم بە ماندووبوون نەكرد !چونكە ڕووح بە تۆقە و سەلام و پێكەنین بە ڕووی بڕوادارانەوە ئاسوودە و ئارام بوو بوو، كە تۆقەم دەگەڵ دەكردن، فەرمایشتەكەی پێغەمبەرم(**صلى الله عليه وسلم**) لەمەڕ سەلام كردن لە مسوڵمان و تۆقە و قسەی خۆش لەگەڵ كردنی و پێكەنین دەگەڵی و دڵدانەوەی هاتەوە بیر؛ كە هەموویان دەبنە پاداشت و چاكە و، كەم هەیە لەبیرمان بن.

هیوادارم تۆش ئەگەر لە ڕێ و بان و كۆبوونەوە و كۆڕ و هەرجێیەكی دیكە - هەرچەندە قەڵەباڵغیش بێت - تووشی مسوسڵمانان بووی، دڵت فرەوان بێت و، لە كاتی تۆقە و سەلام و دڵنەوایی و دوعا و، كاتێك دوعا بۆ ئەو و ستایشی ئەوی دیكە دەكەی، دەم بە پێكەنین بی، چونكە بەو جۆرە هەم ئەوان خۆشیان دەوێی، هەم خوای پەروەردگار پاداشتت دەداتەوە. لەو كاتەوە بە قەڵەباڵغیی كاتی موحازەرە و دانیشتن و كۆبوونەوان، نەك هەر نارەحەت نابم؛ بەڵكو خۆشحاڵ دەبم؛ چونكە لەسەرێكەوە پاداشتی هەیە و، لە سەرێكی دیكەشەوە دڵخۆشكردن و هاوكاریی و پێكەوە جۆشدانی مسوڵمانانە و، ئەوەش لە مەبەستەكانی شەریعەتی پاكی خوایە.

## سەركێشیی مەكە و وە دوای خەیاڵپڵاویی و خەونگەلی گوڵ گوڵ مەكەوە

چەند كەسێك دەناسم و دەگەڵیان دانیشتووم، لە ئیشوكاریان شكستیان هێناوە؛ نەیانتوانیوە ڕۆزیی خێزانەكانیان پەیداكەن، بەڵام نەخشەگەلی خەیاڵییان لە مێشكدایە؛ وەكو: بەشداریی لە كڕینی چەند پارچە زەوییەك لە حەرەمی مەككە و پاشان فرۆشتنەوەی و، پلان دانان بۆ دروستكردنی كۆمپانیاگەلی  پارەوەرگر، كە بەشە پارە لە خەڵكی وەردەگرن و، دەیانكەنە هاوبەش و، پاشان ئەو پارەی وەریانگرتوە دەیخەنە ئیش و، قازانجەكەی بەسەر هاوبەشەكاندا بەشدەكەن؛ جا هەیانە سەری بە بەندیخانە گەیشتوە و، هەشە چاوەڕوانە. بۆیە ئامۆژگاریی من ئەوەیە كە واقیعیی بی و، خۆت نەخەیە نێو داوی سەركێشیی بازرگانیی و دارایی و، وە دوو خەیاڵپڵاویی و خەونی گوڵگوڵدا نەڕۆی؛ چونكە كەسێك لە ئەرك و فەرمانی خۆی، یان لە ئیشێكی سادە سەرنەكەوێت و، ژیانی خێزانی

خۆی پێ دابین نەکرێ، لە پڕۆژەگەلی گەورەی کە تەنها کۆمپانیا گەورەکان، یان ئەو بازرگانانەی(( دنیایان دەقوونە کەو کردوە)) و خاوەنی ئەزموونن، دەرەقەتیان دێن، حەوت جار حەوت جار شکست دێنێت ! واقعیی بە و وەکو خۆت بژی و پێش ئەوەی دەست پێ کەی، پرسیار لە ئەزموونداران بکەو پرس بە خوا (**استخارة**) بکە.

## بێبەش ئەوەیە خزمەتکاری ماڵ و سامان بێت و خوای لەبیرچێت

برادەرێکم بۆی گێڕامەوە، دەیگوت: بازرگانێکی نەزۆك و وەجاخ کوێری ناسیوە، تەماشای کردووە تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێپەڕیوە، هەرخەریکی خزمەتکردنی ماڵ و سامانەکەیەتی و، شەووڕۆژ هەڵپەی بەکرێدانی کۆشکەکانی و دووکانەکانیەتی و، پارەکەی لەسەدان ملیۆن تێپەڕیوە، لەگەڵ ئەوەشدا نوێژی جەماعەت ناکات؛ تەنانەت جاری وایە لە کاتی بانگدا دەچێتە یەکێك لە کۆشکەکانی حساب ، لەگەڵ کرێچییەکانی بکات، بەسەر ئەمدا دەقیژێنێ ، قیرە لەگەڵ ئەو دەکات، لەگەڵ ئەم تێك دەگیرێ و دەنگی بەسەر ئەودا بەرزدەکاتەوە، نە ژنیشی هەیە و نە خێزان؛ بە دەست سامانەکەیەوە حاڵی شرە؛ خواردن و خەو و ئاسوودەیی لێ هەڵگیراوە؛ بایەخ بە شێوە و ڕوخساری نادات، پاشان، لە دوای ئەو هەموو تەمەنە، ڕۆژێك لەپڕ مرد و، خزمێکی دەستی بەسەر هەموو سامانەکەیدا گرت ... ! جا تەماشای ئەو کابرایە بکە؛ بە زیندوویی چێژو بەهرەی لە سامانەکەی وەرنەگرت و، لە پێناوی خواشدا خێر و چاکەی پێ نەکرد، دوای مردن پاداشتێکی پێ وەرگرێ . هەرچەندە نە ژنی هەبوو، نە منداڵ، هەموو ژیانی لە خزمەتی ماڵ و سامانەکەیدا بردە سەر! ئەوەیە بێبەشی... خوایە گیان، لەلا ڕێبوون و گومڕایی بمانپارێزە...

## ئیمان لە گومان و سەرلێشێوان و پەشێویی و نیگەرانیی دەتپارێزێت

فەرمانبەرێکی ڕاگەیاندنم ناسی، بۆ تۆمارکردنی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن دەگەڵمان دەهات، برادەرەکانی پێیان گوتم گومانی لە قورئان هەیە و (شەیتان لێی شێواندوە) پێی وایە دەستکردی پێغەمبەرە(**صلى الله عليه وسلم**) . لەگەڵی دانیشتم و گفتوگۆیەکی دووروودرێژی هێمنانەم دەگەڵ کرد؛ پێم گوت: بەکەیفی خۆت، چت هەیە بیلێ ! تۆ ماڤی خۆتە قسەبکەی و، منیش ماڤی خۆمە گوێم لێ بگری .دەستی بە گوتنی گومانەکانی دەربارەی قورئان کرد، کە هەموویان گومانی سەیر و جێی پێکەنین بوون و، گەمژەترین کەسیش لە دنیا، باوەڕی پێ نەدەکردن. پاشان دەربارەی ژیانی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) و نەخوێندەوارییەکەی و ژیانی لە ژوورێکی لەبەرد دروستکراوی مەککە، لە کۆمەڵێکی سەرەتایی نەفامیدا، نە تەختەڕەشی دیوە، نە تەباشیر و، نە لای مامۆستا و دوکتۆرێك خوێندوویەتی،نەچۆتە مەکتەب و پەیمانگاو زانکۆیەك ، چەند پرسیارێکم لێ کردن و، لە هەموویان دەگەڵم هاوڕا و کۆك بووا! پاشان باسی قورئان و موعجیزەی قورئانم بۆ کرد؛ وەکو: هەواڵی غەیب و نادیار و باسی زانستی گەردووناسیی و بورجەکان و، جیهانی جند و فریشتە و، مرۆڤ و شەیتان و،جیهانی زیندەوەر و ڕووەك و، یاساکانی

شەڕ و ئاشتیی و سنوورەکان (**الحدود**)و، دنیای دایکایەتیی و منداڵیی و، ڕێوشوێن و داب و دەستووری گشتی و، بابەتەکانی سامان و ئابووریی و، هەواڵدان لەمەڕ نەتەوەکانی پێشوو، دەوڵەتە ڕووخاوەکان و سەدەکانی ڕابردوو، بەشێوەیەکی وا وردو دوورو درێژ، کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) نەیدەزانی. ئەوقسانە زۆر کاریان تێکرد و، دەستی بە لەرزین کرد، پاشان هەندێك ئایەت وبەسەرهاتی قورئانم بۆ خوێندنەوە و، بە ژیانی پێغەمبەرمەوە(**صلى الله عليه وسلم**) بەستنەوە، پاشان چەند موعجیزەیەکم بۆ باس کردن . دوای بەینێك برادەرەکانی هەواڵیان پێدام کە ئەوەندە لە ناخەوە دەستی بە نوێژ و قورئان خوێندن کردوە، لەگەڵیان دەگریت... پاك و بێگەردیی بۆ ئەو زاتەی ڕێنمایی  دەکات ! براکانم، بەوردیی قورئان بخوێنن و، بیر لە گەردوون بکەنەوە، ئەو کاتە لەناخی دڵەوە هاواردەکەن :((**أشهدُ أنْ لا اله إلاّ الله ، وأشهد أنّ محمداً رسول الله**)).

## زانست داوای ئیمان دەکات و، هەرکەسێك ورد بێتەوەو بیربکاتەوە، خوا دەناسێت

لەگەڵ هاوڕێکانم ، بە مەبەستی بانگەواز وگوتنەوەی هەندێك دەرس و موحازەرە، سەردانی دەوڵەتێکی عەرەبیمان کرد، باسی مامۆستایەکی گەورەی زانکۆیان بۆ کردین، کە لەو وڵاتەیە و نووسینەکانی لە هەموو لایەك بڵاوبوونەتەوە، دەیانگوت: دەربارەی خواو پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) تووشی گومان بوو ، پاش ماوەیەکی دوور و درێژ خانەنشین بوو، ڕووی کردە قورئان و زۆر بە وردیی کەوتە لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوە و بیر لێکردنەوەی، لە کۆتاییدا هاواری کرد:( **أشهد أن لا إله إلا الله،وأشهد أن محمدا رسول الله**)و گۆشەی مزگەوتی گرت... دەستی کرد بە نووسینی چەندان کتێب لە بارەی قورئانی مەزن و، بە ئیسلام سینگی گوشاد بوو و، دڵی کرایەوە وبۆ لای پەروەردگاری گەڕایەوە و، هەتا قورئانی خوێندبا، چاوی پڕدەبوون لە فرمێسك ... زۆر سەیرە؛ خوا هەر کەسێك پێی خۆش بێت، ئەگەر لە کۆتایی تەمەنیشیدابێت، هەر ڕێنمومایی دەکات و دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست ، کەواتە: قەت لە ڕەحمی خوا نائومێد مەبە و، هەر لەسەرەتاوە پێش ئەوەی ژیانت لە شتی بێ هوودە بە زایە بچێت، دەرفەتی تەمەنت بقۆزەوە و بۆ وردبوونەوە لەم کتێبە مەزنە و، کڕنووشی دوورو درێژ بۆ پەروەردگاری جیهانییان و، زۆر یاد کردنی ئەو خوایەی لەوی بەدەر هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە.

## پەنا بەخوا لە زانستێك سوود نابەخشێت و، لە دڵێك ملکەچ نابێت و، لە چاوێك فرمێسك نارێژێت

لە کەناڵێکی ئاسمانیی بەناوبانگ، چاوپێکەوتنێکی بیرمەندێکی عەرەبیم دی، کە بە فەلسەفەوە خەریك بوو، لە فەڕەنسا خوێندبووی و تەمەنی لە حەفتا هەتڵەبووبوو...دیتم هەموو قسەکانی بریتین لە بابەتێکی فەلسەفیی و چەند ناوێکی دیاری دنیای فەلسەفە، وەکو:سۆقڕات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ و دیکارت و کانت و...... هتد. هەندێك جاریش ئایەتی قورئان بەنموونە دێنێتەوە، بەڵام بە هەڵە دەیخوێنێتەوە و ئاوازیشی دەداتێ،جگە لە مەش، چەند

گومانێك لەمەڕ ئیسلام باس دەكات،كە دەگەڵ عەقڵ و ئایین نایەنەوە. پێم سەیر بوو؛چۆن ئەو هەموو تەمەنەی بەسەربردوە و، تا ئێستاش ڕاستیی نەدۆزیوەتەوە و، لە زانینی وردەكاریی قسەی مرۆڤدا ڕۆچووە، بەڵام عەقڵی، تەنانەت ڕێی چاك خوێندنەوەی قسەی پەروەردگاری مرۆڤیشی پێشان نەداوە و، هەر نازانێ ئایەتی خوا بەڕاستیی بلێت و دەریببڕێت ! سەرەنجام چاوپێكەوتنەكە – كە زۆر دوورو درێژ بوو – كۆتایی هات و، بەشێوەیەكی گرژو مۆن وقین لەدڵ، گومان و نەخۆشیی و ژەهرەكانی خۆی ڕانواندن . یەكسەر ئەم ئایەتەی قورئانم هاتەوە بیر : ((أَفَرَءَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَنْ يَهْدِيْهِ مِنْ بَعْدِ اللهِ – ئەی پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم – ئایا ئەو كەسەت نەدیوە كە حەز و ئارەزووی خۆی كردۆتە خوای خۆی و لەسەر زانستی (چاك و خراپ)ڕا خوا گومڕای كردوە و، گوێ ودڵی مۆركردوە و پەردەیەكی بەسەر چاواندا داوە؟بێجگە لەخوا، كێ ڕێنوماییی دەكات؟!)) **الجاثية** (٢٣) . لە خوامان داوایە ڕێنوماییمان بكات و لە زانستێك سوود نابەخشێت و، لە دڵێك ملكەچ نابێت و، لە چاوێك فرمێسك نارێژێت، بمانپارێزێت .

## جاری وا هەیە چاو لەبەر ئازارو لێڵیی، تیشكی ڕۆژ نابینێ !

بووسیریی ڕاست دەكات كە دەڵێ:

قد تنكرُ العينُ ضوء الشمس من رمَدِ وينكرُ الفمُ طعمَ الماءِ مِنْ سقمِ

خۆر بۆ چاوی لێڵ نایەتە بینین نەخۆش پێی تاڵە ئاوی زۆر شیرین

هەروا موتەنەببیش كە دەڵێ:

ومن يكُ ذا فَمٍ مريضٍ يجدُ مُراً به الماءَ الزلالا

هەر كاتێك كەسێك زاری نەخۆش بێ ئاوی پێ تاڵە با زۆریش خۆش بێ

لە هۆڵی چاوەڕوانیی لە نەخۆشخانە، لەگەڵ پیاوێك، كە دەستەڵاتدارێكی گەورەی دەوڵەت بوو، خانەنشین بووبوو، دانیشتم، دیتم ئەو كابرایە دژایەتیی هەر شتێكی دەكرد پێوەندیی بە دینداریی و خواپەرستییەوە هەبێت و، هەر لەگۆترە تۆمەتی دەبەشینەوە و، بۆچوونێكی زۆر سەیری هەبوو؛ پێی وابوو هەموو دیندارێك تەنها ئەكتەرە و، هەموویان فێڵباز و درۆزنن و، دەیانەوێ عەقڵی سادە و فەقیر حاڵان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەكار بێنن و یاریی بە خەڵك بكەن، پاشان بەسەرهاتێكی ئیسرائیلیی هەڵبەستراوی وەك بەڵگەی قسەكانی هێنایەوە و، گوتی:لە مزگەوتێك نوێژی هەینیم دەكرد، وتاربێژەكە لە وتارەكەیدا دەیگوت: ئەوەی جگەرە بكێشێ كافرە و، ئەوەی ڕیشی بتاشێ كافرە و، ئەوەی پۆشاكی شۆڕبكاتەوە، كافرە. بەپێكەنینەوە لەسەر خۆ پێم گوت: جەنابی مامۆستا، تۆ دەڵێی ئەو وتار بێژە لە ڕیاز وتاری داوە و، ئەمنیش پێت دەڵێم: ئایا باوەڕ دەكرێت كە نوێژكەران – كە ڕەنگە ژمارەیان پێنج

سەد، تا هەزار کەس بێت و، بێگومان ڕۆشنبیرو دوکتۆرو مامۆستای زانکۆیان تێدایە – ئەو وتارەیان بەسەردا تێپەڕێت و، لە مزگەوت بچنە دەرێ و، ئەو وتارەشیان بیستبێ کە لەبەر گوناحی بچووك خەڵك کافر دەکات و، لەسەر مینبەر بەندەکانی خوا ئایین بەدەر دەکات، هیچ کەسیش ورتەی لێ نەیەت و دوو قسەی مزر بەو وتاربێژە گێلە سەر لێشێواوە نەڵێت، ئەگەر ڕاست بێ ئەو قسەی کردبێ ؟! ئایا دەکرێ شتی وا لەوڵاتی مەککە و مەدینەی جێی دابەزینی سروش ڕوو بدات و، وتار بێژێکی گەمژەی لاڕێ، قسەی وای بەدەمدا بێت؟! مەبەستەکە ئەوەیە کە هەر کەسێك دڵی خۆی بە گومانان تاریك کردبێت و، بڕیاری پێشوەختی لەسەر ئایین و ئایینداران دابێت ، دیارە هەر لەگۆترە تۆمەتان دەبەشێتەوە و،کوێرانە تەقە لەڕاست و چەپ دەکات، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێت: ((**وإذا دعوا إلى الله ورسوله ليحكم بينهم إذا فريقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ،وإن يكن لهم الحقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ** – ئەو کاتەش کە بۆ (قبوولکردنی یاساو دەستووری) خوا و پێغەمبەرەکەی بانگ بکرێن، تا داوەرییان لەنێواندا بکات، لەنەکاو هێندێکیان ڕوووەردەگێڕن ، بەڵام ئەگەر هەقیان بەدەست بێت (وبزانن کە بەسوودی وان داوەریی دەکرێت) بەملکەچی بۆی دەچن)) **النور** ( ٤٨-٤٩ ) .

## نوێژ بەچاکیی بکە هەموو کارو بارێکت ڕێکدەبێ و هەموو ئیشێکت چاك دەبێ

. لە ژیانمدا کەسم نەدیوە ، نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا بەڕێوجێ و ملکەچی کردبن، کاری ڕاست نەهاتبێ و دڵی خۆش نەبووبێ و ڕۆزیی بە ئاسانیی دەست نەکەوتبێ؛ خوای گەورە دەفەرمووێ : ((**وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ** – فەرمان بە بنەماڵەکەت بکە بە نوێژکردن و بۆخۆشت ئارامی لەسەر بگرە، ئێمە ڕۆزیمان لەتۆ ناوێ؛ ئێمە ڕۆزیی بەتۆ دەدەین و سەرەنجامی چاکیش هەر بۆ پارێزکردن لەخوایە)) **طه** – (١٣٢).. هەر کەسێکیشم دیبێت ، نوێژەکانی بەچاکیی نەکردبن و تێکیدابن ، ئیش و کاری تێکچووە و لێی ئاڵۆزبووە و، بیری پەرت و بڵاو بووە و ژیانی شێواوە.

ئەم نوێژە هەر دەڵێی سەرچاوەی خۆشیی و ئارامیی و ئاسوودەییە ، بۆیە لە قورئاندا لەدوای یەکتاپەرستیی ، گەورەترین بابەتە، خوا دەفەرمووێ: ((**وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ** – (لە ژیانتاندا هاوکاریی لە سەبر و نوێژ بخوازن ، بێگومان نوێژیش لەسەرشانی بێ فیزانی ( دڵ زیندوو) نەبێ، زۆر سەختە)) **البقرة**( ٤٥ ).. پێغەمبەریش **(صلى الله عليه وسلم)** ، کارێکی لێ عاسێ بووبێ، یان ناڕەحەتییەکی بەسەرهاتبێ، نوێژ سەرچاوەی ئاسوودەیی ودڵخۆشیی بووە و، فەرموویەتی:(( **أَرِحْنَا بِالصَّلَاةِ يَا بِلَال** – بیلال، بە نوێژ ئاسوودەمان کە)). جا دوای ئەو تەمەنەی ئەزموونم کردوە و، ئەو شتانەی خوێندوومنەتەوە و، ئەو خەڵکەی تێکەڵیان بووم، ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە کە: ئەوپەڕی بایەخ بە نوێژەکانت بدەی؛ زۆر بەڕێوجێ و بەجوانیی و بیرکردنەوە ،

لەکاتی خۆیاندا بیانکەی و، لەلات گرنگترین بابەت بن، بە جۆرێك هەرکە گوێت لە بانگ بوو، دەڵێ: (**أَللّهُ أَكْبَرْ ، أَللّهُ أَكْبَرْ**)، هەر کارێکی هەتبوو؛ کۆبوونەوە ، تەلەفۆن، بۆنە، دیدار و چاوپێکەوتن، نووسین....هتد، رایگرە و، دەست بە نوێژ بکە ؛خوا دڵخۆش و ئاسوودەت دەکات و، دەرگای ڕۆزیی و خێرو خۆشیت لێ دەکاتەوە و، دەبێتە دۆست و پشتیوانت. ئاگات لە نوێژەکانت بێت و بە بیرکردنەوە و وریایی بیانکە؛ چونکە تۆ ڕاز و نیاز دەگەڵ پەروەردگای خۆت دەکەی ؛جا ڕۆژێ پێنج جار بەو ڕێژنەی ڕەحمەت و ڕووبارە خواییە دڵت بشۆ ؛ گوناحەکانت ڕەشدەبنەوە و، لەژەنگوژاری خراپە و بەدکاریی پاك دەبیەوە. سەرفرازیی و سەرکەوتن بۆ نوێژەکەران، چاوڕوونیی بۆ کڕنووشبەران ، خۆشیی لە بەچۆکداهاتووان لەبەر خوا.

## شوێنی زانایان کەوەو بگەڕێوە سەر قسەی خەڵکی سەرڕاست

لە گرتووخانە، سەردانی ئەو بیرخلیسکاوانەم کرد کە کۆمەڵی مسوڵمانان بە کافر دەزانن و، ڕێبازی (خەواریج) یان گرتوە، هەندێکیانم دواندن؛ بڕێکیان هەڵگری بڕوانامەی ناوەندیی و ئامادەیی بوون، ڕقیان لە زانایان بوو و خۆیان لێ نەدەدان، ئەوە یەکەم کارەساتیان بوو؛ جنێویان بە زانایان دەدا و، بە دژی دادپەروەرییان دەزانین و، بەم جۆرە لە زانستی بەسوود وەدوورکەوتبوون و، وە دوای حەزو ئارەزووی خۆیان کەوتبوون و، چەکیان لە دژی کۆمەڵی مسوڵمان هەڵگرتبوو و، بە کافریان دەزانین و خوێنیان حەڵاڵ کردبوون .

وەسیەتم ئەوەیە پرسیار لە خەڵکی زاناو پسپۆڕ بکەی ، وەکو خوای گەورە دەفەرمویٚ:(( **فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ** – ئەگەر شتێکتان نەزانی، لە خەڵکی زاناو شارەزا بپرسن)) **النحل** (٤٣) ... دەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانان بی و لە هەموو ئیش و کاریکدا، پرس بە خەڵکی شارەزا و سەرڕاست و خاوەن ئەزموون بکەی؛ چونکە خەڵکی وا هەیە کەم ئەزموون و کەم تەمەنە و تەنانەت لە کاروباری دنیاشدا، نەزانە و سەرکوێرانە ڕەفتاردەکات.

جا ئامۆژگاریم ئەوەیە کە :بۆ کاروباری ئایین بچیە لای زانایاناو، بۆ کاروباری دنیاش ، هەر بوارە و بچیەلای پسپۆڕی خۆی ؛ بۆ بابەتی ئایین، لە زانایانی شەریعەت بپرسە و، بۆ بابەتی ئابووریی لە خەڵکی ئابووریزان و، بۆ بابەتی پزیشکیی، لەپزیشکان و بەم جۆرە....((**قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُ نَاسٍ مَشْرَبَهُمْ** – هەر کەسە بە بەشە ئاوی خۆی دەزانیٚ )) **البقرة** (٦٠)..((فیتوێ بەبرالەی بیٚ لیٚو مەسپێرە)) و، لەوبابەتانەی لێیان شارەزانی ، تەنها پشت بە خۆت مەبەستە؛ چونکە بەهیلاك دەچی. عاقڵ ئەو کەسەیە سوود لە خەڵکی شارەزا وەردەگرێت؛ هەر یەکە و پسپۆڕیی خۆی و، پرس و ڕاوێژ بە خەڵکی ڕاست و شارەزا و دڵسۆز دەکات و، بەم جۆرە دەگاتە بۆچوونێکی ڕێك و تەواو و هۆشێکی سەر ڕاست و، لە مەترسیگەلی دنیا و دوارۆژ ڕزگاری دەبێت .

## خۆت بناسە و سەنگ و نرخی خۆت بزانە

دوو کەسم دەناسین ، ئەهلی ئایین و پابەندبوون و بەردەوامبوون لەسەر ئاییندارىی بوون ، بەڵام خۆشەویستیی ماڵ و سامان و بازرگانیی بەسەریاندا زاڵ بوو و ، لەرێگەی هاوبەشیی و تێکەڵ کردن ، سامانیان کۆ دەکردەوە؛ یەکیان کۆمپانیایەکی وەرگری دانا و، پارەی بە ملیۆنان لە خەڵکی وەرگرت ، پاشان هەستی کرد زەرەر دەکات ، چوو قەرزێکی یەکجار زۆری کرد و پێشی نەدرایەوە، سەرەنجام کەوتە زیندان و ، تا ئێستاش گیراوە، خوا دەرووی لێ بکاتەوە. پێم سەیر بوو کەوتە داوی ئەو بابەتە؛ زۆر خەڵکی چاکەخواز و بەئەزموون ئامۆژگارییان کرد ، بەڵام وەرینەگرت و ، بەبێ نەخشەو پلان، دەستی بە پارە وەرگرتن لە خەڵك کرد و، قەولی قازانجی قەبەی پێ دەدان و ، متمانەی لەکن هاوبەشەکانی لای خۆی پەیداکردبوو و، بە ڕاست و چەپدا پارەی دەبەشیەوە و، بە خەیاڵی خۆی بەردەوام لەسەرکەوتندا بوو ! ئەوی دیکەش هەر بینە نۆرەی هات ، جاران کە بەسەر بازرگانانەوە دەگەڕا ، کە پڕۆژەگەلی هەن لەسە تدا سەت قازانج دەکەن ، ئێستا مایەپووچیی خۆی ڕاگەیاندوە !

لە ڕاستیدا ئەو کابرایە قەت پێشتر ئەو بەرو بازاڕەی تاقی نەکردبۆوە و، شتی وای نەکردبوو ، بەڵام چ دەگەڵ تەماع و چاو چنۆکیی و ماڵپەرستیی دەکەی؟! جا وەسیەتم بۆ تۆ ئەوەیە: پارووی لە خۆت گەورەتر مەکە و، هەنگاو بە هەنگاو ڕێگەی ژیان بگرەبەر و، هەر بەقسەی خۆت مەکەو، متمانە بە هەموو کەس مەکە و، ئەنجامی ئیشەکانت لەبەرچاو بگرە و، ڕێی گەڕانەوەت لەبیر بێ و ، هەوڵدە میانەڕەو بی و ، پێش ئەوەی دەست بە کارێك بکەی ، پشت بە خوا ببەستە و پرسی پێ بکە و، پرس و ڕاوێژ بەخەڵکی زانا و دڵسۆز بکە.

## هەمیشە ئەم هەموو دوژمنایەتیی و گیانی تۆڵە و ڕق و قینە ، لەپای چی؟!

ئامۆژگاریکار(واعیز) یێك دەناسم ، قەت نەمدیوە تووڕەو تۆسن و ترش و تاڵ و ڕووگرژ نەبێ ، ئەگەر ئامۆژگاریی خەڵك بکات ، هەڕەشە و گەف و کوڕی دنیا دەکات و، هەر ترسە بەبێ ئومێد و، تۆقاندنە بێ مژدە و، لەسەر شتی زۆر بچووك قەڵس دەبێت و، بەردەوام سام و هەڕەشەی لێ دەبارێ و، لە سەرپێچیکاران لەکەمینداىە؛ هەر دەڵێی خوا تەنها ئەوی ڕزگار کردوە، یان ئاگای لە عەرش و قورشە و، دڵنیایە لە عەزاب ڕەهایە و لەنێو قەدی بەهەشتدایە! لە دڵی خۆمدا گوتم: ڕەنگە ئەو لەخۆڕازیبوونەی ناخی ئەو کابرایەی داوەشاندوە، کارەکانی پووچەڵ کاتەوە؛ چونکە هەرجارێك باسی کۆمەڵی دەکرد، لیچی لێ هەڵدەقرچاند و، باسی گوناحبارانیشی ، هەر بەبێز و تورەبوون دەکرد. پێم سەیربوو ئەوەندە لە خۆی بێ ئاگایە؛ ئاخر بۆ خۆشی گوناح و تاوان دەکات و، دەبوو لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) بێت و، لەسەرخۆ و میهرەبان بێت و، لەگەڵ مسوڵمانانی گوناحبار دڵنەرم بێت و، هێندە تووڕەنەبێت و، بەرانبەر مسوڵمانان گرژ و مۆن نەبێت و، وشەی توند و تیژ بەکار نەهێنێ و، لە ڕەفتاریدا ڕەق و سەختگیر نەبێت ... بەڵام بۆم ڕوونبۆوە، کە سەرڕاستی و ڕاستەڕێ بوون، لە خوا وەیە و، هەرکەسێك خوا بیەوێت تووشی خێر و چاکەی بکات ، ئاکارجوان و مەشرەبخۆشی دەکات و، دڵی دەکاتەوە و، وای لێدەکات لەگەڵ بەندەکانی ، نەرم و نیان و میهرەبان بێت؛ بەڵام ئەوانە هەموویان چەند بەهرەو ئاکارێکی بەرزن،

وەکو ڕۆژیی لەلایەن خواوەندی شارەزای لێزانەوە دەدرێنەخەڵکی . لەخوامان داوایە بمانکاتە ڕێنیشاندەری ڕاستەرێ ، نەك سەر لێشێواوی سەر لێشێوێن و، بەزەییمان بەبەندە بڕوا دارەکاندا بێتەوە و، لەگەڵ مسوڵمانانی گوناحبار نەرم و نیان بین....

## ماف بەهەموو خاوەن مافێك بدە و خەڵك لە شوێنی شیاوی خۆیان دانێ

هەڵوێستێکی سەیر و نامۆ ، کە زۆر کاری کردۆتە سەر ژیانم، تا ئێستاش هەر لەبیرمە؛ لە بۆنەیەکی گەورەبووین ، پیاو ماقووڵێك ، کە بە لووتبەرزی و خۆبەزلزانین بەناوبانگ بوو ، لەگەڵ کوڕەکانی وەژوور کەوت ، دڕی بەکۆڕ و دانیشتنە کەدا و چووە پێشی پێشەوە، کۆڕەکە جۆرەها کەسی وەکو : قوتابیی زانست و، خەڵکی ڕووحانیی و خواپەرست و، مامۆستایانی گەورەی لێ بوو.. کە نە هیچ گوێی دانێ و نە ئاوڕی لێ دانەوە و، ڕاوەستا ، چاوەڕوان بوو خەڵك سەلامی لێ بکەن و بەخێری بێنن؛ بەڵام بێجگە لە هەندێك خەڵکی ئاسایی ، کەس گوێی نەدایە، ئەویش بەڕوخسارێکی گرژ و مۆنی ڕەش داگەڕاو لە خەڵکەکەی ڕوانی و دانیشت و، کوڕەکانیشی لە ڕاست و چەپیەوە، تەماشای خەڵکەکەم کرد، بە چاوی غەزەبێ تەماشایان دەکرد و، لەوپەڕی بێزاریی و نارەحەتیدابوون .

سەرم لەو دەروونە بەدخوازە سوڕما؛ چۆن هەموو خەڵکەکەی وەلا ناو، سووکایەتیی بە هەمووان کرد و، بێ ئەوەی مافی سەلام و زەردەخەنەیان پێ بدات ، لە پێشەوە دانیشت ، هەر چەندە قوتابیی زانستی لێ بوو ، زۆر لەوی زاناتر و ، بەتەمەنی وا کە لە تەمەنی بابیدا بوو و، پیاوی ڕووحانی ، کە لە ئیسلامەتیدا زۆر لەپێش ئەو بوو ! لەو بەسەرهاتە پەندم وەرگرت و فێربووم کە مرۆڤ پێغەمبەر بکاتە سەر مەشق لەوەدا کە هەرکەسە لەشوێنی شیاوی خۆی دانێت و، بەگوێرەی خۆیان ڕێزیان لێ بگرێت و، شەرم لە بابای پیر بکات و، زانا بە شکۆدار بزانێت و، بەزەیی بە بچووکدا بێتەوە و، بە قسەی خۆش و بزە و پێکەنین و گاڵتەو میهرەبانی و بێ فیزیی، ڕوو لە بەندەکانی خوا بکات ، کە بەوە دەبێتە دڵنیشنیان و دوعای بۆ دەکەن و ، شاهیدیی چاکەی لەلای خوا بۆ دەدەن و ، لە پاشەملە و پاش مەرگیش ستایشی دەکەن ، ئەوەش باشترین دەستکەوتی مرۆڤە وەکو (دوڕەید) دەڵێ: (**وا نما المرء حديث بعده فكن حديثاً حسناً لمن وعى** ). شاعیرێکی کوردیش دەڵێ:

(دەوران دەوڵەتت لەدەست دەستێنێ – بەڵام ناویچاك تاسەر دەمێنێ).

## زانستێكی كەمی بەسوود لە زانستێكی زۆری بێ سوود چاكترە

دوو كەسم ناسین، یەكیان: پێشنوێژی مزگەوتێك بوو لە گوندێك و هەندێك قورئانی لەبەر بوو و، ( **ریاض الصالحین**)ی زۆر دەخوێندەوە و، لەقەدەر توانای خۆی میهرەبان و بێ فیز بوو و سوودی بە خەڵك دەگەیاند؛ سەردانی نەخۆش و لێقەوماوانی دەكرد و دەچۆ نێو هەژاران و ، ئاشتەوایی لەنێوان خەڵكدا دەكرد، خەڵك خۆشیان دەویست و بە چاك و میهرەبان و نەرم و نیان باسیان دەكرد .... ئەمە یەكێكیان ...... سەرۆك دادگایەكی خانەنیشنم ناسی ، كەكتێبی شەریعەت زۆر دەخوێنێتەوە، بەڵام بە حەیاتی خۆی وتارێكی نەداوە و موحازەرە و دەرسێكی نەگوتۆتەوە، ئەوەندە وشك و دڵرەق و چارەگرانە، خۆی لە ئاشتەوایی كردنی نێوان خەڵك نادات و، ئەوەندە خۆی پێ زۆرە، هەموو كەس لێی دەپرینگێتەوە.

سەرم لەو دووانە سوورماوەو پەندێكم لێ وەرگرتوون؛ ئەویش ئەوەیە كە شەرت ئیشە؛ تەماشای پێشنوێژی مزگەوتەكە بكە، سەرەڕای كەمیی زانستەكەی ، چۆن خوا كردوویەتی بە مایەی سوودێكی زۆر و، تەماشای ئەوەی دیكەش بكە، زانستێكی زۆری هەیەو بۆتە سەرۆكی دادگا ، بەڵام لە زانست و پلە و پایە و ئاكار و ڕەوشتی ، سەقیلیی كردوە و، لەكن خەڵكی ئێسكی قورسە و، لە كۆمەڵ نیمچە دابڕاوە...... خوا پەنامان دات .....

كەواتە:زۆریی زانست و ماڵ و سامان شەرت نییە؛ بەڵكو شەرت ئیشكردنە ، سەركەوتنیش تەنها لە خواوەیە..

## لە دین و دنیا بوو

لە ماوەی ژیانم چەند كەسێكم ناسیوون وەك جوولەكەی فەقیر ، نە دنیایان هەیە، نە دین ؛ تەماشادەكەی كابرا ، كەچی سنوورەكانی خوا دەبەزێنێ و، پەیڕەوی شەریعەتی خوا ناكات و ، سەرباری هەژاریی و دەستكورتیی ، ڕقی لەئایین و ئاییندارانە و هەموو دەمێ لە خەڵكی چاكەكار داخ لەدڵە و، ڕقی لە ئەهلی چاكە و زانستە و، نە دینی هەیە بیپارێزێ و، نە دنیاشی وەدەست كەوتوە . لە بەرانبەریشدا: چەند كەسێكی دیكەم ناسیون و تێكەڵیان بووم ، خوا لەباری دین و دنیاوە دەرووی خێری لێ كردوونەتەوە و، دەوڵەمەندی گەورەن ، لەگەڵ ئەوەشدا لە حەرەم لە ڕیزی یەكەمی نوێژن و سەرگەرمی قورئان خوێندنن و، شەو نوێژ و تەراویح دەكەن ، سەرباری خێر و خێرات و كاری چاكەو سەرپەرشتیی هەتیوان و دروستكردنی مزگەوت، كەواتە:دین و دنیایان وەدەستهێناوە : ((**ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة** – خوایە گیان ، لە دنیا و دوارۆژدا چاكە و شتی بەسوودمان پێ ببەخشە)) **البقرة** (٢٠١ )،ئەم ڕێوشوێنە باشترین كارە و سەركەوتنیش لە خواوەیە ، خەڵكیش وەكو پەنجەی دەستن ، هەموویان وەكو یەك نین ، هەیانە لەڕووی دین و دنیاوە دەروویان لێكراوەتەوە، هەشە لە دین زۆر باڵایە، بەڵام دەستكورتە و گیرۆدەی دنیایە، هەندێكیش لەدنیا چاكی بۆ هاتوە، بەڵام زۆربەی چاكە و بەشی ئەولای لەدەستچووە، ئی واش هەیە، لە هەردووك لا بووە و، نە دینی هەیە، نە دنیا، ئەوەش هەمووی پەندی تێدایە؛ وەكو شاعیر دەڵێ : **ما احسن الدين و الدنيا اذا اجتمعا ! و اقبح الكفر والإ فلاس بالرجل !**

چەند چاكە دنیا و دین پێكەوە بن ! نەداریی و كوفر یەك بن هەر نەبن !

## دیمەنگەلی فریودەر بەسەرماندا زاڵ بوون و لە ڕاستیەکان بێ ئاگا بووین

چەندان کۆمەڵ دەناسم بایەخ بەو بۆنە گشتیی و ئاهەنگانە  دەدەن ، سەمایان تێدا دەکرێت و ، شەونخوونییان تێدا دەکێشرێت و ، پارەیەکی زۆریان تێدا سەرف دەکرێت بێ ئەوەی زانستێکی بەکەڵك ، یان سوودێك یان پاداشتێکیان لێ چاوەڕوان بکرێت؛ چونکە بۆنە و ئاهەنگەکان شێوازی خۆ هەڵکێشانی تیرەگەریی و دەمارگیریی  نەفامانە و ڕەگەز پەرستیی و خۆهەڵکێشان و ڕووو بینیی و خۆ بەزلزانین و خەڵك بەکەم زانین و دەستبلاویی و زێدەڕۆیی لە خواردن و خواردنەوەیان  بەسەردا زاڵە.لە بەرانبەردا، زۆر کۆمەڵی هەژارم دیتوون ، بایەخ بە دروستکردنی قوتابخانەگەلی قورئان پێ لەبەرکردن و مزگەوت و، سەرپەرشتیی بانگەواز بۆلای خوا و هۆشیارکردنەوەی ڕەوەندەکان (**جالیات**) و، کۆبوونەوە لەسەر خێر و چاکە و، ئاشتەوایی کردن لەنێوان خەڵکیدا و، یارمەتیدانی هەژاران بەشێوازێکی بێ فیز و ئارام ، دەدەن. بە خوا هەردووك کۆمەڵم دیتوون و تێکەڵاوی هەردووکیان بووم و؛ بۆم دەرکەوتوە بابەتەکە پشتگیریی خوای گەورەیە و، ئەهلی دەستبلاویی و زێدەڕۆیی و ڕووبینیی و خۆ هەڵکێشان ، کەباسمان کردن ، ئەگەر داوای بەخشین لەپێناوی خودا ، یان دروستکردنی مزگەوت و سەرپەرشتیی هەتیوانیان لێ بکرێت ، خۆ دەگنخێنن و سەقیلیی دەنوێنن ، بەڵام ئەگەر داوای کاروباری تیرەگەریی و بەزمی فریودەری بێ سوودیان لێ بکرێت ، سامان و کاتی خۆیان بۆ تەرخان دەکەن. ئەمەش بەشێکە لەلا ڕێبوون و زیانمەند بوون .....

لە خوامان داوایە ڕێنومایی و ڕاستەڕێمان بکات.

## ئەوەی لە ژیانماندا هاوکات مایەی پێکەنین و گریانە

خەڵکێك دەناسم چەندان سەعاتی دوور و درێژ خەریکی قسەی هەللەق و مەللەق و بەتاڵ و بێ سەروپان و، ئەگەر پێشیان بلێی : هەندێك قورئان بخوێنن ، دەڵێن: کاتمان نییە و، پێیان بلێی: یادی خوا بکەن ، تەنبەڵیی و لەشگرانیی دەنوێنن. بەڵام پێیان خۆشە باسی نرخی شمەك و دەنگوباس و باران بارین و، هەڵکردنی با و هاوین و زستان و، کێ سەفەری کردوە و کێ نەیکردوە و، کێ ژنی هێناوە و، کێ تەڵاقی داوە و، پلەکانی گەرما و دەرمانخانەکان و، نرخی مەڕ و حوشتر و مانگا و ئەو شتانەبکەن ! لەمەوە  بۆم دەرکەوتوە  سەرکەوتن و ڕاستە ڕێ بوون ، عایدی خوایە و، لە خەڵکی ئاسایی چەندان پیرەپیاو دەناسم لە کردنی نوێژی سوننەت و، نویژ کردن لە کاتی خۆیدا تەپن و ئەگەر نوێژیان کرد ، لەبەر پیریی و بەساڵدا چوون ، یان بەدانیشتنەوە، یان لەسەر کورسیی نوێژ دەکەن ، بەڵام لە ئاهەنگەکانی خۆنواندن و سەماکردن و دەعوەت کردندا ، بەشداریی دەکەن ؛ چونکە خەڵك هانیان دەدات و بابەتەکە تیرەگەریی و چەند دیمەنێکی ساختەیە. جا تەماشاکە چۆن لە گوێڕایەڵیی خوا تەنبەڵیی دەنوێنن ، بەڵام بۆ خۆونکردن و کاری بێهوودە گورجوگۆڵن ؛ کەواتە: ئاگات لە خۆبێت ؛ چونکە تەمەنت لێپرسینەوەی لەسەرە و، خولەکەکان زوو تێدەپەڕن و ڕۆژەکان دەڕۆن و، سەرمایەی تۆ تەنها کاتە، جا لە شتی چاك و بەسووددا سەرفی کە، لە خوام داوایە  پشتیوانمان بێت و ڕاستەڕێمان کات ؛ چونکە تەنها ئەو هۆکاری سەرکەوتنە و، لەو بەدەر هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییەو ، تەنها ئەو پەروەردگارە .

## ئاسوودە بنوو و تەنها بیر لەخوای تاك و تەنیا بكەوە

پێش چەند ساڵێك بیری خۆم بە قسەی خەڵكییەوە سەرقاڵ دەكرد و، جاری وا هەبوو قسەیەك كە لە كەسێكەوە بیستبووم ، لە سینگی خۆمدا دەمهێشتەوە، یان هەڵوێستێكی بریندارکەری كەسێك ، بیرم لێ دەكردەوە و، بەو هۆیەوە تووشی دڵتەنگیی و خەم و خەفەت دەبووم ، بەڵام دوای ئەوەی ئەزموون و سەفەر و ئاگاداریم زیادی كرد ، پێش نوستن تەنها بیرم لە( **استغفرالله**) و زكرەكانی نوستن دەكردەوە و، بیرەوەرییەكانم دەربارەی خەڵك و قسە و هەڵوێستەكانیان وەلا دەنان ، ئیدی هەستم بە ئاسوودەیی و ئارامیی دەروونیی و دڵكرانەوە كرد و، بۆم دەركەوت ئەم ڕێگایە باشترین كارە بۆ ئەوەی خۆت ئاسوودە و دڵخۆش كەی و ئارام و ئاسوودە بنووی.

چونكە تۆ گەر خەڵكت لە دڵی خۆت دەرهاویشت و، تەنها زكری پەروەردگاری خەڵك و قسەی پەروەردگاری خەڵكت هێشتەوە، هەست بە ئاسوودەیی و ئارامیی دەكەی؛ بەڵام ئەگەر هەرچی قسەی ناخۆش و هەڵوێستی خراپ و ڕەفتاری دزێوە، خەزنت كرد ، ئەوە قەت بەئاسوودەیی نانووی و ، ئەو هەڵوێستانە دەبنە ڕق و قین و حەسوودیی. كەواتە:پێش نوستن دڵت بشۆ و سینگت پاككەوە و بیرت بەتاڵ كە؛ بۆ ئەوەی خۆشیی و شادیت دەستكەوێت و، چێژ لە ئیمانت وەربگری و، دڵت بە زكری پەروەردگارت ئارام و ئاسوودە بێت و ، كردەوە چاكەكانت بێڵیەوە و تەندروستیت بپارێزی. مەنوو تا ڕووحی خۆت لە هەموو كەس ، بێجگە لە خوا و زكر و كتێبەكەی، پاك دەكەیەوە.

## شەیتان بەڵێنی هەژاریتان پێ دەدات

خوای گەورە بەڵێنی ڕەحمەت و چاكە و دەوڵەمەندیی و فەرحانیمان پێ دەدات و ، شەیتان بەڵێنی هەژاریی و نەداریی و كەمدەرامەتیی (( **الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الفَقْرَ وَيَأمُرُكُمْ بِالفَحْشَاءِ ، واللهُ يَعِدُكَم مَغْفِرةً مِنهُ وَ فَضْلاً واللهُ واسِعٌ عَلِيمٌ** – شەیتان بەڵێنی هەژاریتان پێدەدات و فەرمانتان بە بەدكاریی پێ دەكات و، خوا بەڵێنی لێخۆشبوون و چاكەتان لەلای خۆیەوە پێدەدات و، خوا ( ڕەحمەت ) فرەوانی هەرە زانایە.)) **البقرة** ( ٢٦٨ ) . ڕۆزیی ئێمە لە ئاسمان بڕیاری لەسەر دراوە و یەكلابۆتەوە؛ خوا دەفەرمووێ: (( **وفي السماء رزقكم وما توعدون** – ڕۆزیی ئێوە و ئەوەی ( بەهەشت و دۆزەخ )كە بەڵێنتان پێ دراوە و (باران) لەئاسمانە )). **الذاريات** ( ٢٢ ) ، جا ئەوانەی خەڵك لە دارمانی ئابووریی و كەمبوونەوەی شمەك و هەژاریی دەترسێنن ، ئەوانە نوێنەری مەكتەبی ڕەشبینیی و نائومێدین ؛ كە خوا لە قورئاندا فەرمانی پێ كردووین خۆی لێ لادەین ؛ چونكە شەیتان ڕابەرایەتیی شاڵاوێك دژی بڕواداران دەكات ؛ كە شاڵاوی ترساندن و ڕاچڵەكاندنە.... چونكە شەیتان ، وەكو خوا بۆمان باس دەكات ، بەڵێنی هەژاریمان پێ دەدات و ، بەدكاریمان پێدەكات..... لە بەرانبەریشدا شاڵاوی هیواو گەشبینیی هەیە، كە خەڵاتی خوایە و بڕواداران ڕابەرایەتیی دەكەن و ، مزگێنی پێ دەدەنە بەندەكانی خوا ؛ خوای گەورە دەفەرموێ: (( **والله يعدكم مغفرةمنه و فضلا والله واسع عليم** – خواش لەلای خۆیەوە، بەڵێنی لێخۆشبوون و بەخشێشتان پێ دەدات و ، خوا ڕەحمەت فرەوانی هەرە زانایە)). **البقرة** ( ٢٦٨ ) . خوا ئێمەی بەبێ دابینكردنی ڕۆزیی دروست نەكردوە، ئەگەر لە

نەوت ڕۆزیمان دەست نەكەوت ، لە زەویی و زارەوە بۆمان دێ ، ئەگەر لە زەویی و زاریش دەستمان نەكەوت ، لە كشتوكاڵەوە بۆمان دێ ، ئەگەر لە كشتوكاڵیش دەستمان نەكەوت ، لە ئاسن و سامانی دیكەوە بۆمان دێ و ..... بەم جۆرە. هەڵبەت ڕۆزیی خواش فرەوانە و، پشتی پێ ببەستن و، خوای گەورە ڕۆزیی چۆلەكە و مێروولە و پەپووسێمانە و مار و هەموو دەعبایەكی داوە ، كە بەستەزمانیشن ، تۆ كە مرۆڤێكی بیسەر و بینای ، پێت وایە ئەو زاتە لێزان و شارەزایە، ڕۆزیی ئەو دەعبا بێزمانانەی دابین كردووەو ئی تۆی دابین نەكردوە؟! دڵنیا بە قەت لە برسان نامری و، گومانی تێدا نییە هەر دەگەیە ڕزق و ئەجەلی خۆت؛ جا خاترجەم بەو پشت بەو بەدیهێنەرە ببەستە، كەبێجگە لەو هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نییە و، هەر ئەو پەروەردگارە و، بەخشش و چاكەی فرەوانە. مزگێنیشتان دەدەمێ، لەگەڵ (**استغفرالله**) ڕزق و ڕۆزیی بەلێشاو دێت و، دەرگاكانی خێر و بەرەكەت دەكرێنەوە. بە خوا خێر و بەرەكەتی فرەوانی خوای باڵا دەست لە هەموو ساڵێكدا هەیە و، پێشینیان ، سەرباری هەژاریی و نەداریی و سەبرگرتنیان ، لە خەڵكی ئێستا ساغتر و گورجو گۆڵتر بوون و، هەندێكیان خواردنی ڕۆژێكیان نەبووە، پشتیان بە خوا بەستوە و بە بەشی خوا ڕازیی بوون و، قەناعەتیان هەبووە. پیاوێك ، كە دكتۆرای لە پزیشكیی هەیە، بۆی گێڕامەوە كە بابی پیاوێكی ئاسایی بووە، مرۆڤێكی چاك ودەم بەزكرو قورئانخوێن وئەهلی شەونوێژ بووە، ئامۆژگاریی كردوە: هەر بیر لە ڕۆزیی ئەمڕۆت بكەوە و، وەك چوێلەكە بە كە تەنها بەدوای ڕۆزیی ئەمڕۆیدا دەگەرێ ؛ چونكە ڕۆزیی بەیانی، خوا دابینی دەكات. پشت بە خوا ببەستن و، متمانەتان بە بەڵێنی خوا بێت و، گوێ مەدەنە ئەو قسەوقسەلۆك و دەنگۆیانەی سەرباز و شاگردەكانی شەیتان ، بۆ شپرزە كردنی خەڵك بڵاویاندەكەنەوە، وەكو: ئابووریی بەم زووانە دادەرمێت و، زیانەكان چەند قات دەبن و، قەرزەكان كەڵەكەدەبن و ،هەژاریی و نەداریی ، ژیانی خەڵك دادەگرێت..... ئەوانە هەموویان گومان و قسەی بێ بنەمان ، خوای گەورە، كە لە هەموو سەخییەك سەخیترە، ڕۆزیی دابین كردوە؛ كەواتە: ئاسوودە و دڵنیابن و پشت بە پەروەردگارتان ببەستن .

## لەو كتێب و ماڵپەڕە زیان بەخشانەی ژەهر بڵاودەكەنەوە ئاگات لەخۆ بێت

لە( جاكارتا ) ی ( ئەندەنووسیا )، گەنجێكی ڕۆشنبیری عەرەبم دیت، ئەو كتێبانەی كۆدەكردنەوە كەمسقۆف ( ملحد) و خەڵكی دیكە نووسیویانن و گومان لەمەڕ ئیسلام بڵاودەكەنەوە و، بوختان بۆ بنەرەتەكانی ئایین هەڵدەبەستن .... تەماشام كرد لەنێو گێژاوی گومان و نیگەرانیی و پەشێویی و دوودڵیدایە و، پرسیارێكی زۆری لە مێشكیدا كۆبۆتەوە و، بۆم دەركەوت هەر خەریكی ئەو جۆرە كتێبانەیە و، لە زانستی قورئان و سووننەت دوورە. بە تەواویی دڵی هەلا هەلا بوو بوو و، لەنێو پەشێویی و دوودڵیدا دەژیا و، شەو وڕۆژ بە دەست چەندەها گومانەوە دەیناڵاند. چونكە ڕێی بەخۆی دابوو ماوەیەكی زۆر گوێ لەقسەی دڵنەخۆشان و ، خەڵكی گومڕاو لاڕێ و خراپ و دوور لەڕێبازی خوا ڕاگرێت . هەڵبەت خوای گەورە فەرمانمان پێ دەكات خۆمان و بیرو باوەڕ و عەقڵمان بپارێزین:

((**وَاذا رايت الذين يخوضون في اياتنا فاعرض عنهم حتيٍ يخوضوا في حديث غيره** – ئەگەر كەسانێكت دیتن وەنێو

ئایەتەکانی مە دەکەون ، پشتیان تێکە، تا دەچنە نێو بابەتێکی دیکە)) **الانعام** (٦٨) ، بەڵام ئەو کەسەی ڕێ بە خۆی بدات ، بەبێ پاشخانێکی مەحکەمی زانستیی و، شارەزایی لە ئایین ، گوێ لە هەموو قسەیەك بگرێت و، بچێتە نێو ماڵپەڕی گوماناویی ، ئەوە بێگومان دەبێتە قوربانی نیگەرانیی و دوودڵیی و، جۆرەها گومان و دڕدۆنگیی. جا ئامۆژگاریت دەکەم خۆت بپارێزی و، لە کتێبی خوا وردبییەوە و لە زانایانی ڕۆچوو بپرسی؛چونکە سەرەنجامی ئیلحاد خۆکوشتنە لە دنیادا و، دۆزەخ و غەزەبی خوایە لە دواڕۆژدا. خوای گەورە ئێمەو ئێوەش لە فیتنەگەلی گومراکەر بپارێزێت و، بمانکاتە ڕێنوماییکاری ڕێنومایی کراو ؛ ئەوانەی لەسەر ڕێی ڕاستن و بەئیزنی خوا لە هەڵخلیسکان پارێزراون؛جا وریای خۆتان بن.

## خۆت هەرزانفرۆش مەکە و ژیانت لەشتی کەم و بێ سوددا سەرف مەکە

هەندێك کەس دەناسم زۆربەی کاتەکانیان لە گێرە و کێشەو مەحکەمەدا بەسەردەبەن ، لەسەر بابەتگەلی هیچ و کەمی ، وەکو پارەیەکی زۆر کەم ، یان ڕێگاو بان و کێڵگە، یان نێوانی زەویی لە گوندی زۆر دوور و شتی لەم بابەتە. کە ئەوە ناهێنن سەعاتێك لەتەمەنی خۆیان تێدا سەرف کەن ، پێم سەیر بوو چۆن بەم کارانە، کردەوە چاکەکانیان لەنێودەبەن و خراپەکان لەسەرخۆیان کەڵەکە دەکەن و ، کاتەکانیان بەفیڕۆدەدەن و خەیاڵیان نارەحەت دەکەن و دڵی خۆیان تەنگ دەکەن ؛ چونکەدوژمنایەتی کردنی خەڵك و گێرەو کێشە و مشتومڕ دەگەڵ کردنیان ، بەرەکەتی تەمەن ناهیڵێت و ، کات بەزایە دەدات ، چونکە پشتیوان و سەرخەر هەر خوای تاك و تەنها و بالادەستە. چەند کەسێکی دیکەش دەناسم ، لەو شتانە وەدوورکەتوون و چاوپۆشیی و نەرمیی و لێبوردنیان لەگەڵ ئەوکەسانەی هەڵەیان بەرانبەر کردوون ، نواندوە و، بەو هۆیەوە، بەختیار وئاسوودە ژیاون و، کاتیان بۆ گەڕاوەتەوەو ، ئەمەش هەمووی لەبەرئەوەی خوا بۆ پاراستی کاتەکانیان و کۆکردنەوەی خێرو چاکە و، دووركەوتنەوە لە خراپە، ڕێنومایی و ڕاستەڕێی کردوون . کەواتە: کات و سەردەمی خۆت بناسە و، خۆت هەرزانفرۆش مەکە و، ژیانت لەشتی کەم و بێ سوودا سەرف مەکە و، لەسەر هیچ بابەتێکی سادە، کە ئەوە نەهێنێ ئەرك و کاتی تێدا سەرف کەی ، ڕامەوەستە؛ بەڵکو تێپەڕی کە و نەرمی بنوێنە و لێبوردە بە و چاوپۆشیی بکە. خۆ ئەگەر بە ناچاریش کەوتیە نێو داوی ئەو وردەواڵە و، تووشی دادگا بووی ، ئەوە پارێزەرێك بگرە بەهەق و ڕاستیی بەرگریت لێ بکات و، دڵت لە ڕق و قینە پاك کەوە، بۆ ئەوەی کانیاوی ژیانت شلوێ نەبێت و، ڕوون و بێگەرد بمێنێتەوە. چونکە هیچ شتێك وەکو چوونە نێو فیتنەو دووژمنایەتیی و، مشتومڕی بێهوودە و، ناکۆکیی بێ کەڵك لەگەڵ بەندەکانی خوادا ، خێر و چاکە لەنێونابات و، گوناحان زیاد ناکات و، کات و تەمەن بەزایەنادات . پێغەمبەر(**صلى الله عليه وسلم**) بەختەوەریی لەم فەرمایشتەدا کورتکردۆتەوە:((**أمسك عليكَ لسانَكَ ، وليسعْكَ بيتُكَ ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئتِكَ** – زمانت بگرە و، با ماڵت هێندە فرەوان بێ ، جێت بێتەوە و، لەبەر گوناحەکانت بگری)) . **رواه الترمذي** (٢٤٠٨)

## لەبەرانبەر ئامرازەکانی سەردەم خۆت ون مەکە، تووشی دڵتەنگیی و نیگەرانیی بی

هەندێك پزیشك دەیانگێڕایەوە کەچەند منداڵێکیان هێناون بۆ خەستەخانە، تووشی پەشێویی و دڵتەنگیی و نیگەرانیی بووبوون ؛ چونکە کەسوکاریان پشتگوێیان خستبوون ؛ ئەوانیش سەرگەرمی ئامرازە تازەکانی سەردەم ( تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان) بوون و، خوویان پێوە گرتوون و بەردەوام دەگەڵیان خەریك بوون ، تا تووشی دڵتەنگیی و نیگەرانیی و، پاشان گرژبوون و توورەیی و هەڵچوون بوون و، سەریان بە دکتۆر و نەخۆشخانە گەیشتوە و، هەندێکیان، بەهۆی ئەو ماندووبوون و دەردو کوێرەوەرییەی دەگەڵ ئامرازەکانی سەردەم کێشاویانن ، تووشی بێخەویی بوون و، فێری خواردنی دەرمانی هێورکەرەو بوون.... کەواتە: لەخۆتەوە دەست پێ بکە و بەکارهێنانی ئامرازەکانی وەکو تەلەفزیۆن و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو: تویتەرو فەیسبووك یووتووب و ئینستیگڕام و

ئەوانە کەم بکەوە و، لە وانە و لە هەموو شتی دیکەشدا نێوەنجیی بە؛چونکە ئەو ئامرازانە سەرنجڕاکێش و فریودەرن و، ئەوەندەیان بێزارکاریی و هەواڵی ناخۆش و دەنگۆی نیازپیس تێدان، هۆش و ئارامیی و سەلامەتیی دەروونیی و ئاسوودەیی ناوخۆت دەشێوێنن، کەواتە: خۆت ڕزگار کە . پێشتر ئامۆژگاریم کردی کە بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەك دانێ و، کاتەکانت دابەش کەی و، دڵت لە خەم و ناخۆشیی ئاسوودە کەی؛ چونکە ئەگەر دڵت لەدەستدا و خۆت لەکیسچوو ، بە هەموو خەزێنەی دنیا و گەنج و زێڕ و زیوی زەویی، بۆت تێهەڵنایەوە. لە خۆتەوە دەست پێ بکە؛ چونکە هۆش و دڵ و گیانت، هەقی بەسەرتەوە هەیە.

## ئەگەر بەڵایەکت تووش هات حیسابێك بکە

پیرەپیاوێکی بەساڵداچوو ، گلەیی ڕەوشی خراپی دارایی و، قەرزە کەڵەکە بووەکانی و باری ناڵەباری ئابووریی خۆی لەکن کردم ، ئەمنیش پێم گوت : سەبرت هەبێ و بەتەما پاداشتی خوابە، خوا دەرووت لێ دەکاتەوە و، پێویستە زۆر ( **استغفراللە**) بکەی و، نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا بکەی؛ چونکە خوا قەولی بەو کەسانەی کە نوێژ لە کاتی خۆیدا دەکەن ، داوە، ڕۆزییان پێ ببەخشێت، پاشان پێم گوت: ئێستاش تۆ زۆر باشی و، لەنێو نازو نیعمەتدای ! گوتی:چاکی چم ؟! ناز و نیعمەتی چی ؟! ئەوە نییە بەهۆی باری ناڵەباری دارایی و ئەو هەموو قەرزەی لەسەرمە، هەموو ژیانم خەم و کەسەرە ! پێم گوت: ئایا حاڵی حازر کە تۆ قسە بۆمن دەکەی ، چەندەها کەس لە ژووری بوژاندنەوەی دڵ، لەژێر چاودێریی چڕدا نین؟! گوتی: با ... گوتم:چەندان کەسیش لە زینداندا چاوەڕوانی ئیعدام ناکەن و، چەندەها کەسیش بەیەکجاریی (**مُؤَبَد**) لە زیندان نین؟! گوتی: با ... گوتم: چەندەها کەسیش لەسەر ماددە ی هۆشبەر و ، بابەتی بێڕەوشتیی و بەدکاریی نەگیراون ؟! چەندەها کەسیش لەناموس و سومعەو ناوبانگیاندا، تووشی بەڵا و کارەسات نەبوون و، چەندان کەسیش شتی خراپتریشیان بەسەر نەهاتوە؟! گوتی: ئەوانە کێن ؟ گوتم: کافر و مسقۆف و بووزیی و سیخ و هیندۆس و مرۆڤپەرست و ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەر(**صلى اللە علیه وسلم**) نییە و، بەهەشت و دۆزەخ ناناسن ، باشە، پێت خۆشە دەوڵەمەندترین کەسی دنیا بی، بەڵام باوەڕت بە خوا و پێغەمبەر(**صلى اللە علیه وسلم**) نەبێت ؟! گوتی: پەنا بەخوا، چۆن شتی وا دەبێت ؟!

گوتم : حەزدەكەی هەموو خەزێنە و گەنجی دنیا ئی تۆ بێ، بەڵام بە شتێك كەحەددی شەرعی لەسەر بێ، حوكم درابی؟! گوتی: پەنا بە خوا، نەخێر ! پێم گوت: پێت خۆشە خاوەنی سەرپاكی كۆشك و وتێل و بانكەكانی دنیا بی و، كەسێكی بێتاوانت كوشتبێت و چاوەڕوانی حوكمی ئیعدامی خۆت بی ؟! گوتی: پەنا بە خوا ! دوای ئەوە سوپاسی خوای گەورەی كرد و، بەدڵخۆشیی هەستا . كێشەی ئێمە ئەوەیە كە بەردەوام بیرمان لەسەر ئەو بەڵا و كارەساتانە چڕ دەكە ینەوە كەتووشمان دەبن و، ئەو هەموو نیعمەتە زۆر و زەوەندانەی لەهەموو لایەكەوە دایانپۆشیوین ، نابینین ، كەواتە: سوپاس بۆ خوا تاڕازیی دەبێت و، سوپاس بۆ خوا كەڕازیی بوو و، سوپاس بۆ خوا دوای ڕازیی بوونیش . جا ئەگەر بەڵایەكت بەسەرهات ، حیسابێك بكە و، ئەو شتانەی لە بەرژوەندیی تۆن و، ئەو شتانەی لە دژی تۆن، بژمێرە، بۆت دەردەكەوێ، براوەی و، بێگومان تای تەرازووی نیعمەتەكانت، بەهۆی ئەو بەڵایانەی بەسەرت هاتوون تا لەگوناحەكانت پاك كەنەوە، زۆر قورس دەبێ. كورت و كرمانجیی: هەموو ئیشەكانی خوای گەورە ڕەحمەتن .

## پەنا بۆ ئەشكەوت بەرن پەروەردگارتان ڕەحمەتی فرەوانی خۆیتان بەسەردادەدات

چوومە نێو كۆمەڵێكی لادێیی بۆ چارەسەری چەند كێشەیەك، ئەوەندەم قسەی سەیر و ناكۆكیی و موشتومڕ و سوێندی گەورە، لەو خەڵكە دژ بەیەكە بیست و دیت، تەواو دڵم ئێشا و خەمم خوارد و، هەستم بە نا ڕەحەتیی كرد لەو دانیشتنانەی هیچ دەرفەتێكی بۆ ئامۆژگاریی و وە بیرهێنانەوە و سوودوەرگرتن لە كات تێدا نییە ، چونكە زۆربەی ئامادەبووان ئاساین و ، بەشێوەیەكی هەرەمەكیی و بێ سەروبەر قسەدەكەن ، قسە پێك دەبڕن ، بەرپەرچی یەكدی دەدەنەوە ، ئیدی هەرایەكە ئەوسەری دیار نییە!

لە ڕاستیدا دڵڕاگرتنی كۆمەڵایەتیی و مافی تیرە و هۆز، ناچاری چوونە نێو ئەو دانیشتن و كۆڕانەیان كردم ،جا كاتێك هەستم بە نارەحەتیی كرد،چوومە نێو مزگەوتێك و، لەوێ ماوەیەك مامەوە و، هەندێك زكرم كرد و قورئانم خوێند و دڵم ئاسوودە بوو ، قسەی خوای گەورەم هاتەوە یاد، كە دەفەرموێ:((**فَأْوا إلى الكَهْفِ يَنْشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَ يُهَيِّء لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقاً** – پەنا بۆ ئەشكەوت بەرن، پەروەردگارتان ڕەحمەتی فرەوانی خۆتان بەسەردا دەدات و كارتان بۆ ئاسان دەكات )). **الكهف** ( ١٦ ) . كەواتە:جارو بار هەر دەبێ بە خۆت و ئایینەكەتەوە، لە هەرا و ژاوەژاو دابڕێی، تا دڵی خۆت دەستكەوێتەوە و،خۆت خڕكەیەوە؛ بەڵام ئەگەر بكەویە داوی كۆڕو كۆبوونەوە و، ئامادەی هەموو بۆنەیەك بی و، هەركەسێك قسەی كرد، گوێی لێ بگری و، لە كاتی بێ ئیشییاندا تێكەڵاوی خەڵك بی، ئەوە خوا ڕەحم بە ئایینەكەت و دڵنیایی و ئاسوودەییت بكات !

كەواتە: هەندێك جارخۆت لە خەڵك دابڕە و، بڕۆ نێو گۆشەگیرییەكی شەرعیی و ڕەوا دەگەڵ كتێبی خوا و، زكری خوا بكە، دەگەیە ئارامیی و ئاسوودەیی و، هەر كەسێك ئەوە، تاقی بكاتەوە، لەو ڕاستییە حاڵیی دەبێت.

## به ئامادەبوون ومانەوەی بەردەوام لە كەعبە لە كاتی نوێژاندا خۆی قوتاركرد

بازرگانێكی سعوودیە دەناسم،زیانێكی دارایی زۆری كرد و، زۆربەی سامانەكەی لە دەست چوو، ئەوەندە خەمبار و دڵتەنگ بوو، تووشی نیگەرانیی و خەمۆكییەك بوو ، هەرخوا بزانێ! پێی گوتم: دنیام لە پێش چاوان ڕەش بوو، بەعاستەم نانم پێ دەخورا،خەوم نەماو هەموو ئیش و كارێكم لێ ئاڵۆز بوو، ڕۆژێك بیرێكی وام بەمێشكیدا هات، كە بچمە كەعبە لە مەككە؛ڕۆیشتم لە پەنا كەعبە نیشتەجێ بووم و، بەردەوام هەر پێنج نوێژم لە مزگەوتی حەرام دەكرد و، لە نوێژی شێوانڕا تا خەوتنان و، لە نوێژی بەیانییەوە تا ڕۆژهەڵات دادەنیشتم و، لە ئاوی زمزمم دەخواردەوە، بە خوا كێوی خەم و خەفەتم لەكۆڵبۆوە و دەروونم گوشاد بوو و، هەستم بە دڵنیایی و ئارامیی و ئاسوودەییەكی سەیر دەكرد، وا تێگەیشتم ئەوەی تووشم هاتووە پاك و پوختەكردن بووە، بۆیە بەو ڕووداوە زیاتر هەستم بە نیعمەت و خۆشیی كرد، پەیوەندیم بە ماڵ و خێزانمەوە كرد كە تەندروستیم باشە و، لە چاكترین حاڵدام و، گەلێك ئایەتم دووبارە دەكردنەوە و، بە وردی بیرم لێ دەكردنەوە و، خێرم بە هەژارەكانی حەرەم دەكرد و، ئەو ڕۆژانەی لە كەعبە بەسەرم بردن، خۆشترین ڕۆژی هەموو ژیانم بوون و، هەندێك جار ، لە كاتی چاوەڕوانیی كردنی نوێژدا،دەمگوت: ئەگەر خەڵكی بەهەشت وەك من لە خۆشیی و شادیی و بەختەوەریدا بن، بەڕاستیی ژیانیان خۆشە ! تەماشاكە چۆن ئەو پیاوە ڕە فتاری لێزان و عاقڵانی ئەنجام دا و،چووە ماڵی پاشای پاشایان و، پەنای بۆ خودای تاكی باڵا دەست برد، ئەویش ڕزگاری كرد و،دڵ و دەروونی گوشاد كرد و،خەم و خەفەتی ڕەواندەوە!

## گوێ مەدە قسەی سووك و ڕەخنەی گەمژە و حەسوودان و خۆیان لێ گێل كە

لە سەردەمی گەنجیمدا ، هەركەسێك ڕەخنەی لێ گرتبام،زۆر بەتوندیی، یان بەشیعر یان بە پەخشان یان بە وتار، وەڵامم دەدایەوە، پاشان بۆم دەركەوت ئەمن بەو كارەم عومرم بەزایە و كاتم بەفیڕۆدەدەم و، بە دژایەتیی و ڕاونانی ئەو تارماییە خەیاڵییانەی تەنها لەسێبەرێ دەردەكەون و، هەربەدوای كەموكورتیی و عەیب و هەڵەدا دەگەڕێن و ، لەئاستی شتی چاكدا كوێرن، تەندروستیی و ئاسوودەییم دەشێوێنم ... پاشان بابم (خوا لێی خۆشبێت) كە ئەهلی مزگەوت و قوڕئان و شەونوێژ بوو، ئامۆژگاریی كردم و گوتی:ئەگەر گوێت لە قسەیەكی ناشیرن بوو كە ئازارت دە دات،وابزانە كەڕی و هەر نەتبیستوە و، تەنها وەڵامی قسەی چاك بدەوە؛ ئەویش بە قسەی لە خۆی چاكتر و، هەڵە گەلی ئەوانەی هەڵەت بەرانبەر دەكەن، بەتایبەتیی مسوڵمانان، بشارەوە.

ئەو وەسیەتەشم، وێڕای ئەوەی لەو بارەوە لە قوڕئان و حەدیس بیستبوو و، لە گوێ گرت ، ئیدی بە ڕێی خۆمدا ڕۆیشتم و خەریكی كاری خۆم بووم و، بێ ئاوڕدانەوە لەو بەردانەی لە ڕاست و چەپەوە پێمدا دەدران، ئەركی خۆم بەجێ دەهێنا. هەستم بە دڵنیایی و ئاسوودەیی كرد و، نیشانەكانی سەركەوتنم لێ دەركەوتن و، سوپاس بۆ خودای میهرەبان ، ئیش و كارم ئاسان بوو و، لە گیانی تۆڵەكردنەوە ڕزگاربووم و، بە ئاسوودەیی دەنوستم و،

هەستم دەکرد ئەو جنێو و قسەی سووک و ئازاردانە، مایەی ڕەشبوونەوەی گوناحان و ڕاستکردنەوە و، سەرەنجام سەرکەوتنی زیاترە،وەکو ابو تمام دەڵێ:

واذا أراد الله نشر فضيلة        طويت أتاح لها لسان حسود

لولااشتعال النار فيما جاورت        ماكان يعرف طيب عرف العود

ئەگەر خوا ویستی چاکە وەدەرخا        دێ زمانی حەسوودی لێ وەگەڕخا

ئەگەر داری عوود گڕنەیسوتێنێ        بۆنە خۆشەکەی چۆن با دەیهێنێ؟!

کەواتە: خۆت لە قسەی هەمووان گێل کە و، گوێ بە ئازاردانی گەمژان مەدە و، مەشرەب خۆش بە، دەژی و، بیر لە نیعمەتان بکەوە دەبووژێیەوە و، بیر لە گەردوون بکەوە سەرسام دەبی.

## ڕەفتار وئاکاری جوان و بەرزت لە گوفتارت زیاتر پەیامەکەت دەگەیەنێ

کاتێك سەردانی ئەندۆنسیا و مالیزیاو ڕۆژهەلأتی ئاسیام کرد، پێیان گوتین: باب و باپیرانی ئێوە خەڵکیان بە کردەوەی جوان و ڕەوشتی بەرز مسوڵمان کرد، نەك بە هێزی سەربازیی؛چونکە مسوڵمانان هیچ فڕۆکە و دەبابە و تۆپێکیان نەناردووینە سەر؛ بەڵکو بۆ بازرگانیی هاتوون و، باب وباپیرانمان کە دیتوویانە باب و باپیرانی ئێوە ڕاستگۆ و خاکیی و بەوەفان، هەموویان مسوڵمان بوون.لەبەرئەوە ئامۆژگاریت دەکەم نەك هەر بە قسە و موحازەرە، بەڵکو بە کرداری جوان و ئاکاری بەرزیش پەیامی خۆت بگەیەنی،چونکە قسە ڕاست و هەڵەی هەیە، بەلأم کردار ڕاستگۆیانەترە و، خەڵك قسە و کردارت بەراورد دەکات ؛ لەبەرئەوە خودای گەورە دەفەرموێ:((**أتأمرون الناس بالبرِّ وتنسون أنفسكم وأنتم تتلون الكتاب أفلا تعقلون** – ئایا فەرمانی چاکەکردن بە خەڵك دەکەن و خۆتان لە بیر دەکەن وقورئانیش دەخوێننەوە ؟! ئەوە تێناگەن؟!)) **البقرة** (٤٤). هەروا دەفەرموێ: (( **يا أيها الذ ين امنوا لم تقولون مالا تفعلون ؟ كبر مقتا عندالله أن تقولوا مالا تفعلون** – ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ، بۆچی ئەوشتەی دەیلێێن، نایکەن ؟ خوا زۆر لێتان تورە دەبێ ، ئەگەر ئەوەی دەیلێێن نایکەن!) **الصف** ( ٢ ، ٣ ).

هەوڵدە ڕەفتار و کردارت جوان وشیاو بێت ؛ ئەو کاتە خەڵك متمانە بە قسەکانت دەکەن و، دێنە سەر قسەی تۆ و، پەیامەکەت بەڕاست، دەزانن.

## قەناعەت و ڕازیبوون بە بەشی خوا، ڕێگەی بەختەوەرییە

چەندان جار چوومە بەریتانیا و، لە کۆڕ و دەرسان چاوم بە ڕەوەند ﴿جالیە﴾ی سۆماڵ کەوتوە؛ ئەو دڵ و دەروونە پاکانەم زۆر بەدڵ بوون ، کە سەرباری کەمیی داهاتیان، قەناعەتیان هەبوو و، بە بەشی خوا ڕازیی بوون، تەماشام

دەكرد سەر گەرمی زانست و ئیش و بانگەوازن و، دەگەڵ خەڵكی دەوروپشتیان،زۆر تەباو ڕەبان ، دەچووینە هەر مەڵبەندێكی ئیسلامیی، ئەوان بە زەردەخەنە و ڕووی گەشەوە، لە پێشی پێشەوە بوون، لە هەر كامێكیانم دەپرسی: حاڵت چۆنە؟ دەیگوت: سوپاس بۆ خوا زۆر باشم ... بەوپەڕی قەناعەتەوە، لە ناخی دڵیەوە ، كە پڕبوو لە ئیمان و ڕازی بوون بە بەشی خوا، وای دەگوت...هەرچەندە لە وڵاتی خۆیان دەركرابوون و، لە خێزان و كەس وكاریان دابڕابوون و، كە وڵاتیان بە جێهێشتبوو، هەندێكیان ئیشیان دەست نەكەوتبوو؛ یان بەعاستەم كەمە ئیشێكیان دەكرد، یان قەرزی لە براكانی دەكرد و لەسەری دەژیا، بەلاَم دەگەڵ ئەوەشدا لەڕادەبەدەر ئاسوودە و خۆشحاڵ و ئارام بوون. هەندێك كۆمەڵی دیكەم هاتنەوە بیر، كە دەیانناسم و،دەسترۆیشتوو و دەوڵەمەندن و دەستبلاَویی و زێدەڕۆییەكی زۆر دەكەن، سەرباری ئەوەش ، ئەوەندە لە نیگەرانیی و دڵەڕاوكێی و خەم و خەفەتدا دەژین، هەر باس ناكرێ ! جا بۆم دەركەوت كە قەناعەت و ڕازییبوون بە بەشی خوا، بناغەی ئارامیی و ئاسوودەیی و دڵخۆشییە. قەناعەتت بەوەی خوا پێی داوی، هەبێت ، دەوڵەمەنترین كەس دەبی و، بە كاری خوا ڕازیی بە ، پێش بەهەشتی دواڕۆژ، دەچیە بەهەشتی دنیا: ((**أدخلوها بسلام** – بەئاشتیی و سەلامەتیی بڕۆنە نێوی)) **الحجر**- (٤٦) .

## شوفێری تاكسییەك یەك دنیا ڕەزامەندیی و قەناعەتی هەیە

هەندێك جار حەزدەكەم لەگەڵ خەڵكی ئاسایی سواری سەیارە بم، گوێ لە دەنگوباسیان بگرم و، واقیعی حاڵی خۆم بزانم، جارێك لەگەڵ شۆفێری تاكسییەك، كە پیاوێكی بەتەمەنی سعوودیی بوو، لە شەست ساڵ تێپەڕ یبوو و، دوای خانەنشین بوونی، سەیارەیەكی كڕیبوو و، كرێی پێ دەكرد... لە مەككەوە بۆ جدە سواربووم، لە حاڵ و باڵیم پرسی، بەعادەتی خۆی سوپاس و ستایشی خوای كرد و ، گوتی: ژیانی ڕۆژێ بۆ ڕۆژێ یە؛ لەبەیانییەوە تا بەرەبەری ئێوارێ ئیش دەكات و ڕۆزیی بۆ خۆی و خێزانی پەیدادەكات و، دوای عەسر هەندێك گۆشت و میوە دەكڕێت و، دەگەڕێتەوە ماڵێ. دەیگوت: كە شەویش داهات، بەوپەڕی ئاسوودەیی و دڵخۆشیی لەگەڵ ماڵ و منداڵم دادەنیشین و، بە قسەی خۆش و پێكەنین مەجلیسەكەمان گەرمدەكەین، لە ژیانمدا هەست بە خەم و خەفەت و بێزاریی و ڕۆتین ناكەم؛ چونكە هەموو كەس دەگەڵم سوار دەبێ، زانا و نەزان، هێمن و تووڕە...دەنگو باس و بەسەرهاتی ژیانی خەڵكی دەبیستم و بۆم دەبێتە ئەزموون وخەمڕەوێن... بیر لە دروستكراوەكانی خودا دەكەمەوە و ڕادەمێنم و دەجووڵێم و بە حەز و تامەزرۆییەكی زیاترەوە، بەرانبەر ماڵ و خێزانم، دەچمەوە ماڵێ... من كە بە ڕەنجی شانی خۆم بژێوی خۆم پەیدادەكەم، تام و چێژێكی زۆر لە ژیان دەكەم...لەم جۆرە قسانەی دەكرد. قەت ئەو ڕوخسارەم لەبیر ناچێ كە پێدەكەنی و، بە بەشی خودا ڕازیی بوو و، قەناعەتی بەوەی خوا پێی بەخشیبوو ،هەبوو. ئەو كەسانەم هاتنەوە یاد بە ملیاران پارەیان پەیداكردوە و بەردەوام نەخۆشن و،دەرمانی هێوركەرەوە دەخۆن و، نیگەرانیی و دڵەڕاوكە، حەجمینی لێ هەڵگرتوون ! زانیم بابەتەكە كەمیی و زۆریی ماڵ و سامان نییە، بەڵكو ئارامیی و ئاسوودەیی و قەناعەت و ڕازیی بوون بە بەشی خوا و، پەیداكردنی پارووی حەلاَڵە، با كەمیش بێت،

چونکە ڕەنگە کەمێکی سادەی بەتام، چێژ بەخش بێت و، لەوانەشە زۆرێکی بەگرێ و گۆڵی بێزارکەر، مایەی نیگەرانیی بێت. بە بەشی خوای بەخشەندە ڕازیی بە و سوپاسی لەسەر بکە.

## ئەوەی هاوڕێی قورئان بێت ئاسوودە و دوورەخەم دەبێت

لە (ڕیاز)ی پایتەخت بانگبێژێکم ناسی، چەند مانگێك پێکەوە نوێژمان دەکرد؛ نزیکەی نیوسەعات پێش بانگ دەهاتە مزگەوت و، بەردەوام قورئانەکەی کراوە بوو، پێش نوێژان و دوای نوێژان دەیخوێند... بەپێداگرییەوە لێم پرسی: بە چەند ڕۆژان قورئان خەتم دەکەی؟  دوای هەندێك لاملیی و خۆگنخاندن، گوتی : سوپاس بۆ خوا، بە سێ ڕۆژان خەتمی دەکەم. تەماشای ڕوخساریم کرد، لەبەر تێکەڵاویی زۆری لەگەڵ کتێبی خوای گەورە خۆشیی و بەختیاریی لێ دەباری ... چەندان ساڵ بوو بەو جۆرە بوو؛ هەر بە سێ ڕۆژان چارێك قورئانی خەتم دەکرد...

هیچ کاتی نەبوو بۆ شتی بێهوودە و، قەت ئامادەی ئەو بۆنە و دانیشتنانە نەدەبوو کاتیان بەفیڕۆ دەچوو و، قسەی بێکەڵك و بەسەرهاتی بۆش و بێ بنەما و ڕووداوی جیاجیان تێدا باس دەکران، بەڵکو خەون و خەیاڵی ، هەر ماڵ و خێزان و مزگەوتەکەی بوو و، بووبووە  کۆتری مزگەوتەکەی و، نیشتەجێ و دڵبەندی ماڵی خوا و، خوای گەورەش ئاسوودەیی و ئارامیی دڵ و دەروونی پێ بەخشیبوو. لە زۆربەی ئەو کەسە چاك و بۆ خوا سوڵحاوانەی دیتومن، ئەو دیمەنەم بەرچاو کەوتوە، ئەوانی شەو ڕۆژ لەگەڵ  قورئان ژیاون، خوا دڵ و دەروونی بێ نیاز کردوون و، لەڕادەبەدەر قەناعەت و ئاسوودەیی و شادیی پێ بەخشیون و خەم و خەفەتی بەتەواویی لەکۆڵ کردوونەتەوە . جا ئامۆژگاریم ئەوەیە:هاوڕێی قورئان بە؛ لە ڕێگا هاوڕێی بە، لە نووسینگە لە سەیارەدا، لەماڵێ، ئەو کاتە ژیانت دەگۆڕێت؛جونکە هاوڕێی قورئانی و قورئانیش باشترین هاودەم و، باشترین دڵنەوا و، باشترین هاوڕێیییە !

## وەکو مێش نەبی دەنا برادەر و خۆشەویستانت لەدەست دەدەی

مێش تەنها لەسەر برین دەنیشێت، ئەو کەسەش کە بەتەواوی بەدوای عەیبی خەڵکی و هەڵە و ناتەواوییەکانیاندا دەگەڕێ و، بەهەڵنگوتنەکانیان دڵخۆش دەبێت، ڕق و غەزەبی خوا و خەڵك دایدەگرێت و کەس خۆشی ناوێت .

کابرایەکم دەناسی، ئاواتی ئەوە بوو تۆڵە لە خەڵك بکاتەوە و، لەسەریان باز نەدات، بەردەوام داوایان لەسەر تۆمار دەکرد، هەندێك جار داواکان پەیوەندییان هەر بە خۆیەوە هەبوو و، هەندێك جاریش پەیوەندییان بەمافی گشتییەوە هەبوو . ئەوانە دەروونیان هەر بە زگماك لەگەڵ خراپە و ڕق و قین و بوغزدا هەڵشێلراوە ...
بیرم لەو کابرایە دەکردەوە، بەردەوام لە ناکۆکیی و دوژمنایەتیدایە و ئەگەر شتێکی گوت، یان نووسی، بە ڕق و قین و جنێو و قسەی سووك و فیتنەیی و دووزمانی ، دەیڵێ و دەینووسێ و، هەر خەریکی پشکنینی عەیبی خەڵکی و بەدناوکردن و لەکەدارکردنی ئابڕوویانە، چۆن تەمەنی خۆی بەبا دەدات و، چاکەکانی دەدۆڕێنێت و، گوناح و

خراپەکانی چەند قات زیاد دەکات! کەواتە: پێویستە تەمەنی خۆت بپارێزی و، دەرهەق بە زمان و قەڵەمت لەخوا بترسی و، ئاگات لەکاتی خۆت بێت و، لەشتی بەکەڵکدا سەرفی کەی و، نەکەی زمانپیس و زارشڕ و جنێو فرۆش و عەیبگر بی و، وەکو مێش، هەر ئازار و ناخۆشیی بلاوکەیەوە . خوا ئێمە و ئێوەش لە دۆڕان و ڕەنج بەخەساریی بپارێزێ.

## پیاوێکی بەساڵداچوو خۆی بۆ کاری خۆبەخشانە تەرخان دەکات

مامۆستایەکی زانکۆ لە ولاتی خۆمان، بۆی گێڕامەوە کە پیرەپیاوێك هەیە تەمەنی لە هەشتا ساڵ هەتڵە بووە ، سیستەمێکی سەیری لە کاری خۆبەخشانە هەیە؛ هەموو پێنج شەممەیەك بەڕۆژوو دەبێت و ، لە بەیانییەکەیڕا بە سەیارەکەی وەدەردەکەوێت و، پڕی دەکات لە برنج و ئارد و ڕۆن و شەکر و میوە و، بەسەر چەند خێزانێکی هەژاردا دابەشی دەکات، پاش نیوەڕۆ دەگەڕێتەوە و دەچێ لە مزگەوتی گەورە نوێژی مردوو دەکات و، لە نوێژی عەسرەوە تا نوێژی شێوان لە مزگەوت خەریکی قورئان خوێندن و پاڕانەوە دەبێت، پاشان دەچێتەوە ماڵێ، لەگەڵ ماڵ و خێزانەکەی بەربانگ دەکاتەوە و ڕۆژووەکەی دەشکێنێ. ڕۆژەکانی  دیکەش بەم جۆرە دابەشدەکات: سەردانی خزمان و ئاشتەوایی نێوان خەڵك و سەرپەرشتی کردنی هەتیوان و  سەردانی نەخۆشان لە خەستەخانە، بیانناسێ و نەیانناسێ و، حەفتەی ڕۆژێك بۆچوونە سەرقەبران و سەلام کردن لە مردووی مسوڵمانان و ، گریان و پاڕانەوە و ، بیرکردنەوە و پەندوەرگرتن. سەرباری ئەوە، پیاوێکی دڵساف و نیاز پاکە و غەیبەت و عەیب گرتن لە خەڵك نازانێ و، دەر و دەروونی یەکە و، دوور و نزیك خۆشیاندەوێ و، هەموو کەس ستایشی دەکات و ، دوعای بۆ دەکات .

پاك و بێگەردیی بۆ ئەوزاتەی ڕێنومایی بەندەکانی دەکات و، کێی حەزلێ بێت، پشتی دەگرێت، بابەتەکە پشتگیریی خوایە، جا لە خوام داوایە بۆ سەر ڕاسترین ڕێگا، پشتت بگرێت .

## هەموو ڕۆژێ سەعاتێك بۆ نۆژەنکردنەوەی ڕووح

داوات لێ دەکەم هەموو ڕۆژێ سەعاتێك ، دەست لە تەلەفۆن و شتی بێزارکەر و، قسە و قسەلۆك هەڵگری و بەتەنێ دانیشی  ڕووحت نۆژەن کەیەوە ، ئەوە پێی دەگوترێ ، سەعاتی چاودێری و  لێپرسینەوە و، سەعاتی نۆژەنکردنەوەی ڕووح و، ئاسوودە کردنەوەی دەروون ، لەو سەعاتەدا بیر لە گوناح و تاوانەکانت  دەکەیەوە و، داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەی و، بیر لە  نیعمەتەکانی خوا دەکەیەوە و سوپاسی دەکەی و، نەخشەی کاروباری ژیانت دادەڕێژی و ئاسایشی نێوخۆ  دەگێڕیەوە نێو دەروونت .
لەو سەعاتەدا تەنیا دەبی و، دەستبەرداری ئامرازەکانی وەکو مۆبایل و تەلەفزیۆن و ئەو شتانەی دەبی کە پردی پێوەندیی نێوان تۆو خەڵکن . لەو سەعاتەدا چاکە و خێر و بەرەکەتێکی زۆرت دەستدەکەوێ ، بە هەڵەکانتدا دەچیەوە و ، ئامۆژگاریی وەردەگری و دەروون گوشاد و ئارام و ئاسوودە دەبێ . ئەمن بۆخۆم تاقیم کردۆتەوە و ،

دەربارەی زۆر کەسی دیکەش کە تاقییان کردۆتەوە، خوێندوومەتەوە ، کە سوودێکی زۆریان لێ وەرگرتوە .
ئەو سەعاتە بۆ خۆت دانێ ، دڵت لە ژەنگوژاری ژیان و، چڵك و چەپەری دنیا بشۆی و، بۆ دنیا و دوا ڕۆژت بیری تێدا بکەیەوە و ڕامێنی ، چونکە تۆ بەم ڕێگایە وێستگەیەك بۆ ئەزموون و پەند وەرگرتن و ، خاڵێك بۆ دەستپێکردن و، نێو بڕێك لەو ڕۆژەدا بۆ هەڵگرتنی توێشووی خێر و چاکە ، دادەنێی و ، بۆت دەبێتە مایەی توێژینەوەی نەخشە ڕێگەی ژیانت و، دۆزینەوەی خاڵە بە هێز و لاوازەکانی ڕێکردنت . ئەو سەعاتەت لە بیر نەچێت ، چونکە بۆت دەبێتە هاوکاریی و مایەی چێژ و خۆشی....

## لیستێکی حەفتانەی کارەکان، بەختیاریت بۆ مسۆگەر دەکات

لە حەفتەیەکدا لیستێکی کارە خۆبەخشەکان تاقی بکەوە ، تۆماریانکە ، شوێنەوارە چاك و کاریگەرەکەیان دەبینی . حەفتەی سەردانێك – ئەگەر کورتیش بێت – بۆ خەستەخانە دابنێ و سەردانی نەخۆشی ناسراو و نەناسراو بکە و ، کاتێك  بۆ چوونە سەر قەبران ،دوعا بۆ مسوڵمانان بکەی و پەند و ئامۆژگاری  وەربگری و، کاتێك بۆ سەردانی هەتیو و پەککەوتە و هەژار و  نەداران و، کاتێك بۆ پەیوەندی کردن بە خزمەکانتەوە ، بە تایبەتی بە تەمەنەکان ، کاتێکیش بۆ ئاشتەوایی نێوان خەڵك و ڕێنمایی کردنی  کەسێکی گومڕا ، یان ئامۆژگاریی خەڵك ، یان کارێکی خۆ بەخشانە کە لەگەڵ  ئەهلی چاکە و بە خشین کۆت بکاتەوە . ئەم کارانە وچەند کارێکی دیکەی سوننەتی تایبەتیش لە حەفتەیەکدا ، وەکو ڕۆژووی سوننەت و ، قورئان خوێندن و ، زۆر یادکردنی خوای گەورە ، پشت  بە خوا دەتگیەننە هەواری بەختەوەریی و ، خۆشیی و  ئاسوودەیی دەخەنە دڵ و دەروونتەوە و ، دەست بەجێ شوێنەوارە چاکەکانیان دەبینی ؛ چونکە کاری چاك ، نوور و شادیی و دڵگوشادیی و ئاسوودەیی لێ پەیدا دەبێت . حەفتەی چەند کارێکی چاك ، لەوانەی  باسم کردن ، یان باسم نەکردن ، بۆ خۆت تۆمارکە؛چونکە بۆ خۆت دەزانی ، بۆ کەسێك خوا ڕێنمایی بکات و بۆی ئاسان بکات ، کاری خۆبەخشانە زۆرن .

## تۆ چەندان قەڵای خوایی و زرێی پێغەمبەریت هەن بەڵام نازانی

هەرگیز دوعا و زکر پشتیان لە عەرزێ نەداوم و ڕەنج  بە خەساریان نەکردووم ، چەندان جار کە تووشی قەیران و کێشە بووم ، باشترین ڕزگارکەر و بەلەمی  ڕزگاریم زکر و دوعا بووە . بۆیە هەموو ڕۆژێ کە بەیانیت کردەوە ، بە زکرەکانی  بەیانیان و ئێواران و دوعای شەرعیی ، خۆت بپارێزە ، ئەو کاتە هێمن و دڵخۆش و ئاسوودە دەبی؛ وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (( **الّذين امنوا و تطمئنُ قلوبُهم بذكر اللّة الا بذكر اللة تطمئنُ القلوب** – ئەوانەی  ئیمانیان هێناوە و، بە زیکری خوا دڵیان ئارام دەگرێت، ئاگادار بن دڵەکان هەر بە زیکری خوا ئارام دەبن)) **الرعد** ( ٢٨ ) .

هەڵبەت لە ژیانتدا ، کێشە و قەیران و بەڵا و کارەساتت تووش دەبن ، جا ئەگەر لەو کاتانەدا یارمەتی لە زیکری خوا نەخوازی ، سەغڵەت و نیگەران دەبی و ، سەرپاکی ژیانت دەبێتە دڵتەنگیی و خەم و خەفەت . ئەو شتە بکە کە پێغەمبەرەکەت (**صلى الله عليه وسلم**) فێری کردووی ، با زکری ڕۆژانە و شەوانەت هەبن ، کە زۆر ئاسان و بەردەستن و، لە مۆبایلەکەشتدا هەن ، گرنگ ئەوەیە لەو زرێیانە بێ ئاگا نەبی ، چونکە دژە کێشەی خوایین و، بۆ هەموو کێشەیەك دەبن . چەندان جار هەبووە ، بەڵا و کارەساتمان بەسەر هاتوون، نەمدیوە لە دوعا و زکری خوا چاك و جوان و بەسوودتر ، بە خوا لە فلیپین ، لە ڕاست و چەوە گوللەم بەسەردا دەبارین ، هیچم لە زکر و تەسبیحاتی خوا و، دووبارە کردنەوەی ((**حسبنا اللة و نعم الوكيل** – خوامان بەسە و ئەو چاکترین پشتیوانە))چاکتر نەدی ، سەرەنجامیش : (( **فانقلبوا بنعمة من الله و فضل لم يمسسهم سوءٌ واتبعوا رضوان الله وكان الله ذو فضلٍ عظيم** – پاشان ئەوان( لە دوای هەڵاتنی دوژمن) بە نیعمەت (پاداشت) و بەخششێك لەلایەن خواوە، گەڕانەوە، بەجۆرێك کە هیچ زیانێکیان پێ نەگەیشت و، بە دوای ڕەزامەندیی خوادا دەگەڕان و(بزانن) خوا خاوەنی بەخششی گەورەیە، )) **ال عمران** (١٧٤ ) ..

## لەیەك قسەدا بەختیاریت بۆ کۆدەکەمەوە

لەوەتی کتێبی (لا تحزن – خەمبار مەبە) م نووسیوە و، لەدوای بابەتی بەختەوەریی و ئەوەی لە کتێبە کۆن و نوێیەکان و ، ماڵپەڕ و گۆڤار و دیدار و بەرنامەکانی ڕاگەیاندندا ، لەسەر بەختەوەریی نووسراوە ، دەگەڕێم وسۆراغیان دەکەم، لە دوای ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوون و گەڕانە ، یاسایەکی سادەی کورت و ڕوونم دەستکەوتووە : بەختەوەریی لە یەك قسەدا کورت دەبێتەوە کە بریتییە لە ((ڕازی بوون بە کارەکانی خوای گەورە و بە بەشی خوای گەورە ))؛ ئەگەر بەوەی خوا نووسیویەتی و ئەندازەگیریی کردوە و بەشی کردوە ، ڕازیی بووی و تەسلیمی بووی ، بە بەختەوەریی دەژی و، هەرچی لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ئێستا دەربارەی بەختەوەریی نووسراوە و گوتراوە ، بۆت کورت دەبێتەوە و، دەکەوێتە دەستت . خوا هەرچی بۆی نووسیوی لە شیرین و تاڵ و، هەر ڕۆزیی و شێوە و کار و ئەرك و ڕەچەڵەك (ژریە) وخانوو و بەهرەی کەم یان زۆر ، ئاشکرا یان پەنهان ، بە قیسمەتی کردووی، لێی ڕازیی بە ؛ڕازیی بوون یەکەم یاسای بەختەوەرییە؛ڕازیی بوون بەوەی خوا پێی داوی و بۆی نووسیوی ، گەورەترین کلیلی دەرگای بەختەوەرییە ، ڕازیی بوون بە هەر شتێك تووشی دەبی ، پێت دەدرێت یان ڕووبەڕووی دەبی ، بەلەمی ڕزگارییە لە دەریای ژیاندا ؛ لە خوا ڕازیی بە ، بەوەی هەتە ڕازیی بە ، بەوەی بۆت نووسراوە ، ڕازیی بە ، ئارام و ئاسوودە و دڵخۆش دەبی. هەرچی لە دنیادا لە بارەی بەختیارییەوە گوتراوە ، با بۆت کورت کەمەوە : ڕازیی بە دەچیە بەهەشتی فرەوانی خوا .

## زەردەخەنە بخەسەر ڕوخسارت، ژیانت پڕ دەبێ لە خۆشیی و ئارامیی و ئاسوودەیی

ئێستا دەزانم پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) بۆچی داوای زەردەخەنەی کردوە و، فەرموویەتی: (( **تبسمك فى وجه اخيك صدقة** – بەرانبەر براکەت زەردەخەنە بکەی ، چاکەو خێرە )) **رواه الترمذي** . لەبەر ئەوەیە کە ئەم زەردەخەنە کردنە ، یەکەم هەنگاوە لە ڕێگای دوور و درێژی بەختەوەریی و، بە دروستکردنی زەردەخەنە لەسەر ڕوخسارت ، هەموو شتەکانی دەوروبەرت دەگەڵت هاوئاهەنگ و هۆگر و تەبا دەبن و، دڵەکان ڕووتتێدەکەن و دێنەلات و، ڕێژنەی خۆشەویستیت بەسەردا دەڕێژن . لەگەڵ خەڵکی دەمبەبزە بە ، خێری ڕووخۆشیی بەسەر بەندەکانی خوادا دابەشە ، چونکە ئەگەر ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین بی ، هیچت لە کیس ناچێت ، بەڵکو ئارامیی و ئاسوودەیی و دڵخۆشیت دەستدەکەوێت و، خەڵکی دەوروبەریشت خۆشحاڵ دەکەی و، پەیامێکیان بۆ دەنێری، واتاکەی بریتییە لە :خەڵکینە ، دڵنیا و ئاسوودەبن ، دڵخۆش و ئارام بن، هیچ ترستان لەسەر نییە ! زەردەخەنە بکە ، چونکە گرێ و گۆڵی ڕوخسارت و گرێ و گۆڵی ڕووحت دەکاتەوە و، وەك چوێلەکەی بە جریوەجریوو دڵخۆش ، بەنێو باغی ژیاندا دەگەڕێی . نێو چاوانت تێك مەنێ و، ڕوخسارت گرژ و مۆن مەکە؛ چونکە ئەمە جاڕدانی شەڕی سەخت و بێزاریی و ڕق و قینە لە دژی ژیان و ئەوەی لە ژیاندایە؛بەڵکو ژیانت بە سەلام و زەردەخەنە دەست پێ بکە ؛چونکە ئەو دوو پەیامە گەورە،پەیمانی دۆستایەتیی و، پردی برایەتیی و، چەپکە گوڵی خۆشەویستین بۆ دنیا و خەڵکی دنیا . پێغەمبەری ئێمە (**صلى الله عليه وسلم**) ، لە هەموو کەس زیاتر زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو و، زەردەخەنە و ڕووخۆشییەکەی ، ڕۆڵی گەورەی هەبوو لەوەدا کە خەڵك هۆگری ئایین و پەیامەکەی بن ! بزەی قەناعەت و ڕەزامەندیی ، لەسەر لێوی بە سۆز و ڕووی گەش ، چەند جوانە ! بە ڕاستیی ناونیشانی کتێبی بەها و نموونە باڵاکانە و، تەنها دەروونێکی مەزن و، گیانێکی شاکار و جوان و، دڵێکی ئاسوودە و ئارامی لە خوا ڕازیی ، زەردەخەنە هەڵدەگرێت. بەندەکانی خوا ، زەردەخەنە بکەن !

## خوا مژدەمان دەداتێ و دڵنیامان دەکات ، بەڵام ڕەشبین و ترسێنەرەکان ڕازیی نین

لە (جددە )پیاوێکم دیت ، تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ دەبوو ، لە بۆنەیەکدا ڕۆژێکی تەواو دەگەڵی بووم ، شتێکی مەزنم لەو پیاوەدا بەدیکرد؛ هەتا بڵێی ئارام و ئاسوودە و دڵخۆش و ڕازیی و بەقەناعەت بوو ، لە حاڵ و گوزەرانیم پرسی ، گوتی : ئەمن لە سەرەتای لاویمدا ، کەسێکی لە خوا یاخی بووم و نوێژم نەدەکرد و ، کڕنووشێك چییە ، نەمدەبرد ، ڕۆژێك لەگەڵ بابم دەڕۆیشتم ، ناچاری کردم دەگەڵی بچم عەمرە بکات ، کە گەیشتمە نێو حەرەم ، گوێم لێ بوو پێشنوێژ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (( **قل يا عبادى الذين أسرفوا على أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله إنّ الله يغفر الذنوب جميعاً إنه هو الغفور الرحيم** – ئەی پێغەمبەر، لەلایەن منەوە – بە بەندەکانم بڵێ : ئەی بەندەکانم ، کە (بە گوناحی گەورە) لە زیان گەیاندن بە خۆتان زێدەڕۆییتان کردوە ، لە ڕەحمەتی خوا نائومێد

مەبن ، بەڕاستیی (ئەگەر تۆبە بکەن) خوا لە هەموو گوناحەکان خۆشدەبێت؛ ئەوە کە لێبوردەی میهرەبانە )) (**الزمر : ٥٣**). هەموو قالبم لەرزیی و، مچوڕکم بە لەشدا هات ؛ دەتگوت یەکەم جارە ئەو ئایەتە دەبیستم ، فرمێسکم داباریـن ، بابم لە ڕیزەکەدا ڕاگرت،دەستنوێژم نەبوو ، چووم دەستنوێژم هەلگرت و، پاشان چوومەوە نێو ڕیزەکە و، لەو ساتەوە دەستم بە ژیان کرد و، دەروون و ڕێبازم گۆڕا و، سەرلەنوێ لە گەڵ ئاییـنی خوای گەورە لە دایکبوومەوە... ئەم جارە نوێژەکانم بە ڕێکوپێکیی دەکردن و، قورئانم دەخوێند و، بە ئاسوودەیی زیرم دەکرد ، ئیدی دەروون گوشادیی و دڵخۆشیی و ئارامییەکی هێندە زۆر ڕووی تێکردم ، بەڵێنم بە پەروەردگارم دا ، بە ئیزن و حەول و قووەتی وی ، لەسەر ئەو ڕێگایەی لە کەعبەوە ، بە بیستنی ئەو ئایەتە گەورە دەستم پێکرد ، بەردەوام بم . ئەمنیش ئێستا پێت دەڵێم : بگەڕێوە سەر ئایەتەکە و، بەوردیی بیخوێنە و بیری لێ بکەوە و، لەخۆت پرسە: قسەی کێیە؟ ئایا ئەوە بەبەزەیترین و میهرەبانترین و، بەڕێزترین و بەخشندەترین زات نیە ،کە مزگێنیی تۆبەو ڕەحمەت و لێخۆشبوونمان دەداتێ ؟ ! باشە، بۆچی ئەو مزگێنییە ڕەفز کەین ؟! بۆچی باوەڕ بە ئەهلی ترساندن و سارد کردنەوە و ڕەشبینیی بکەین ؟! ئەوانەی حەزناکەن ئێمە بە قسەی خوا بکەین و، لە تۆبە دەمانترسێنن و،لە ڕەحمەتی خوا تەمابڕمان دەکەن و، وامان لێ دەکەن لە ژیانماندا نا ئومێد و داڕووخاو بین ؟! ئێستا بەڵێنی ڕەحمەت و لێخۆشبوون و چاوپۆشیی خوات بۆ هات ؛ کەواتە : ژیانت دەگەڵ پەروەردگارت دەستپێبکە و، ڕوو لە مزگێنییەکە بکە و ڕێ بگرە بەر و، بە ئاسانکاریی خوا دڵخۆش بە ؛ چونکە تۆ هەڵسوکەوت دەگەڵ زاتێك دەکەی ، ڕەحمەتی هێندە فرەوانە ، هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، لە حەدیسیشدا هاتووە:((**إنّ الله تعالى لّما قضى الخلقَ كتب عنده فوق عرشه : إنّ رحمتي غلبت غضبي** – بێگومان خوای بالآدەست کاتێك لە دروستکردنی گەردوون بۆوە ، لە لای خۆی لەسەر عەرشی نووسی : بەڕاستیی ڕەحمەتەکەم بەسەر غەزەبەکەمدا زاڵبووە )) **رواه البخاري** ( ٧٥٥٤ ).

## ئاسوودەیی دەروون ، ئیسلام و ئاشتییە

لەڕووی بەختەوەرییەوە ، زۆر لە ڕەوشی خەڵکم کۆڵیوەتەوە ، بۆم ڕوونبۆتەوە بۆ ئەم بابەتە دەبێ دووشت بێنە دی :خۆ تەسلیمی خوا کردن بە گوێڕایەڵیی کردنی و مل کەچ کردن بۆ فەرمانەکانی لە لایەك و ، ئاشتیی دەگەڵ خەڵك بەوەی کە مافەکانی خۆیان پێ بدەی و ، ئازاریان پێ نەگەیەنی ، لەلایەکی دیکەوە، کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**) بەم حەدیسە ڕوونی کردۆتەوە :((**المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده** – مسوڵمان ئەو کەسەیە مسوڵمانان لە زمان و دەستی ئەمین بن ) **رواه البخاري ومسلم** ... ((**المؤمن من أمنه الناس على دمائهم وأموالهم** – بڕوادار ئەو کەسەیە خەڵك لە گیان و سامانی خۆیان لێی ئەمین بن )) **رواه الترمذي** ( ٢٦٢٧ ) **والنسائي** ( ٤٩٩٥ )**واحمد** ... بەختەوەریی نابینی ، هەتا بەڕاستیی باوەڕ بە خوای گەورە نەهێنی و لە سزا و عەزابی ئەمین

نەبی و ، خەڵكی لە زیان و ئازاری خۆت ئەمین نەكەی و بە ئاشتیی لە گەڵیان نەژی ؛ ئەوە هەم مافی خوای تێدایە و هەم مافی خەڵك و ، دوو پایەی سەرەكین لە پایەكانی بە ختەوەریی؛كەواتە : تۆ ئەگەر ئەو دوو پایە گەورەت ڕووخاندبن ، دوور مەڕۆ و بەدوای هۆیەكانی دیكەی بەختەوەریدا مەگەڕێ؛ ئیمان بە خوای گەورە وەدی بێنە ، نوور و ئاسوودەیی و ئارامیی و دڵنیاییت دەداتێ و، ئاشتیی دەگەڵ خەڵك وەدی بێنە ، ئەوەش چەمك و مانای سەلام كردنە: ((**السلام عليكم ورحمة الله و بركاته** - ئاشتی و ڕەحمەت و بەرەكەتی خوات لەسەر بێت)) كە هەركاتێك تووشیان بووی ، دەیڵێی ، جا نێوەڕۆكی ئەو سەلامە جێبەجێ بكە و، ببكە بە مایەی ئاشتیی و ئاسوودەیی و ئەمین بونیان لە سەر و ماڵ و نامووسیان . جا ئەگەر ئەو دوو بنەمایەت بەجێهێنان ، دەكەویە نێو ئاشتیی و ئاسوودە دەبی و ئەوكاتە ، لە دنیا و دارۆژدا خاترجەم و بەختەوەر دەبی ، كەواتە: ڕێگەی خۆت پێ زانی و بەردەوام بە ((**فاستقم كما أُمِرتَ** – جا وەك فەرمانت پێ كراوە ، بەردەوام بە )) (**هود: ١١٢**). ئەوەیە ڕەزامەندیی هەرە گەورە كە پشت بە خوا پێی دەگەی و چاو و دڵتی پێ ڕوون دەبنەوە:((**رضي الله عنهم و رضوا عنه ذلك لمَن خشي ربه** – خوا لەوان ڕازی بووە و، ئەوانیش لە ( بەخششەكانی ) خوا ڕازین ، ئەوە بۆ كەسێكە لە (نافەرمانیی) پەروەردگاری بترسێ )) **البينه**(٨).

## دوای پەنجا ساڵ، فێری چوار نەرێ كردنت دەكەم

دوای پەنجا ساڵ خوێندنەوە و توێژینەوە و سەفەر و ئەزموون، ئامۆژگاریت دەكەم بەردەوام پێڕەویی چوار نەرێ كردن بكە:((خەمبار مەبە، مەترسە، تووڕەمەبە، بێزار مەبە)). خەمبار مەبە: خەم لە ڕابردوو مەخۆ و، دەرگای ڕابردوو داخە و، ((لەدوو چووان مەچۆ))و، بیانخە دنیای لەبیرچوونەوە و،لە ژیانێكی نوێ بەردەوام بە، وەكو ئەمڕۆ لەدایك بوو بی. مەترسە: نیگەرانی داهاتوو مەبە، ئەو بۆخۆی دێت، بەڵكو ئەمڕۆ كار بكە و بەرهەمت هەبێ و، بەیانی بۆ بەیانی لێگەڕێ، ئەوەی لە ڕابردوو بۆتە پارێزەرت، ئێستاش هەر دەتپارێزێت. تووڕەمەبە: لە هەڵچوون و قەڵسبوون دووركەوە،؟چونكە ڕەوشت و پێوەندیت لەگەڵ خەڵكی هەڵدەتەكێنی و، كردەوە چاكەكانت لەنێودەبات و ، كردەوە خراپەكانت زیاد دەكات و ، هەموو خراپەیەك، بەزۆریی، سەرچاوەكەی تووڕەییە. بێزار مەبە: لە قەزا و قەدەری خوا سەغڵەت مەبە و، لەوەی خوا بۆی نووسیوی، بێزار مەبە، بەڵكو بە بەشی خوا ڕازیی و ملكەچی بە، دەبیە بەختەوەرترین كەس و، لە بەڵێنی خوا دڵنیا و خاترجەم بە و، بە فەرمانی خوا قایل بە ، بەدلگۆشادیی و ئارامیی و ئاسوودەیی دەژی.

## ئەرك بەجێهێنان لە بۆنەكاندا لەخەم و خەفەت ئاسوودەت دەكات

هەموو ئیشێك لەو كاتەدا بكە، كە پێویستە: ئەگەر زانیت كەسیك نەخۆشە و ماقی لەسەرت هەیە، سەردانی دوا مەخە ، دوایی پەشیمان ببیەوە ، ئەگەر پرسەیەك لەگۆڕێ بوو، لە كاتی خۆیدا برۆ ئەنجامی دە، پیرۆزبایی

هاوسەرگیریی و بۆنە ئیسلامیەکانی دیکەش، هەروا ؛چونکە ئەگەر لە کاتی خۆیاندا ئەنجامت نەدان، ئەوە لە بەجێهێانی ئەرکدا کەمتەر خەمیت کردوە و سەرەنجام هاوڕێ و برادەران لەدەست دەدەی و، چاکە و خێرێکی زۆرت لەکیس دەچێت. ئەو کارانەش کاتیان ئەوەندە ناوێت، بەڵام دواخستن و وەخراندن، تووشی بەزایەدان و زێدەڕۆییت دەکات و ، لەسەر دڵت دەبێتە گرێ ! چەند خۆشە مرۆڤ لە هەموو دەرفەتێکدا ئەرکی خۆی ئەنجام بدات ! وەکو: سەلامکردن لە کاتی دیتنی کەسێکدا ، ڕێزگرتنی میوان ، نوێژکردن لە کاتی خۆیدا ، تەواوکردنی کاری ڕۆژانە بێ دواکەوتن ، دەست پێشخەریی لە کاری چاکدا پێش لەدەستچوونی. کەواتە: بۆ بەجێهینانی ئەرك لەکاتی خۆیدا، با شێلگیریی و سووربوون و یەکلابوونەوەت هەبێ، تا بەهۆی کەمتەرخەمیی، تووشی پەشیمانیی و نیگەرانیی و خەفەت نەبی ((**قَد جعلَ اللّهُ لكُلِّ شيٍ قدرًا – بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازە وڕاددەیەکی داناوە**)) **الصف** (۳). ئەرك بەجێهینان لە کاتی خۆیدا ، دەبێتە مایەی دڵنیایی و ئارامیی و بەختەوەریی.

## کیسە باخەڵەکەی بەردەستت کلیلی بەختەوەرییە

با جزدانێکت لە باخەڵدا بێت ، هەندێك پارەی تێدابێت، کە بە لای هەژار و نەدارانذا ڕەتبووی، بیاندەیە؛دوامەکەوە؛چونکە دواخستنی خێر پێ کردنیان حەسرەتە و، هەرکە کیسە باخەڵەکەت دەرهێنا تاپارەیان بدەیە، ئارامیی و ئاسوودەییە؛چونکە خێر بەڵاو کارەسات دەگێڕێتەوە و، خەم و خەفەت لادەبات.
کەواتە: خۆت لەسەر ئەوکارە ڕابینە و، با هێندێك پارەت هەر پێ بێت و، بۆ خۆت بیکە؛ نەك کوڕەکەت، یان برادەرەکەت ڕاسپێری بۆ خێرکردن، یەکسەر بەدەستی خۆت ئەو خواپەرستییە بەجێ بێنە و، پارەکەت بخە نێو دەستی هەژار و نەدار و هەتیو. هەندێك لە زانایان پێشنیازیان کردوە – پێشنیازەکەشیان جوانە- کە خێزان سندووقێك دانێت و ، هەریەك لە ئەندامانی خێزان ڕۆژانە کەمیك پارەی تێباوێن و ، لە کۆتایی مانگدا پارەکە بدرێتە هەژاران و هەتیوان. خێرکردن دەروازەیەکی گەورەی بەختەوەرییە و، بە سەلامەتیی و ئاشتیی برۆ نێوی، ئاسوودەیی و ئارامیی و دڵنیاییت دەستدەکەوێت

## گەورەترین پرۆژە، کە بەهۆیەوە ژیان و گەردوون و دوارۆژ دەدۆزییەوە، بەجێبێنە

ئامۆژگاریت دەکەم کە گەورەترین پرۆژە لە ژیانتدا ئەنجام بدەی؛ ئەویش ئەوەیە بە جۆرێکی نوێ و تەواو جیاواز لەوەی تا ئێستا خوێندووتەوە، قورئان بخوێنی، بڕیارێکی یەکجاریی بدەی و خۆت یەکلاکەیەوە کە زۆر بەووردیی بیخوێنی؛ وشە بە وشە و ڕستە بە ڕستە و ئایەت بە ئایەت تێی ڕامێنی و بیری لێ بکەیەوە و ، لەسەر هەموو عیبارەت و ڕستە و ئایەتێك ڕاوەستی و، هەرچەندە زۆریشت پێ بچێ؛ لە ڕەهەند و مەعنا و نهێنی و نوورەکانی ڕامێنی و بیریان لێ بکەیەوە؛ ئەم خوێندنەوە بۆ تۆ لە دەیان خوێندنەوەی بێ ڕامان و وردبوونەوە باشترە .
هەندێك بڕوادار وایان کردوە و، ئەنجامگەلی زۆر گەورە وچەندان بەرهەمی بەرچاوی ئیمان و دڵنیایی و هیمەت و هیوایو گەشبینیی و بەختەوەریی و خۆشیی و دڵگوشادیی و پاداشتی مەزن و ئارامیی و ئاسوودییان دەستکەوتوە.
سەرلەنوێ دەستپێبکەوە؛چونکە تۆ هەرگیز کتێبێکی لەم کتێبە گەورەتر و بەڕێزتر و جوانتر ناخوێنیەوە؛ چونکە

بەکورتیی: ئەو قسەی وەدیهێنەری بالادەستە، بەلام هەر کتێبێکی دیکە بخوێنیەوە - کە ملیۆنان کتێب دەبن- ئەوە کتێبی دروستکراوانی لاواز و دەستەوەستانە... دوای ئەوەی دڵ و دەرونت پاك دەکەیەوە و، بە گوێ و بە ڕووحت گوێ لە قسەی خوای لێزانی شارەزا دەگری ، پشت بە خوا ببەستە و لە سوورەتی (فاتیحا)وە دەست پێ بکە؛لەم ڕێگایەوە لێکدانەوەیەکی تەواوی ژیان و گەردوون و قیامەتت دەستدەکەوێ و، قورئان بۆ ڕێگای ڕزگاریی و سەرکەوتن و سەرفرازیی و دڵنیایی دەستت دەگرێت و، بە هاوڕێیەتی کردنی، دەگەیە بەختەوەرییەك، قەت بە دبەختیی بە دوادا نایەت.

گرنگ ئەوەیە باوەڕت وا بێ کە چاکە و سەرکەوتن و ڕزگار بوونت بەم کتێبە مەزنەوە بەندە و، باوەڕت وابی کە خوا تەنها وەك شیفا و ڕێنومایی ڕووناکیی دایبەزاندوە؛ ئیدی قورئان تا دەتگەیەنێتە پلە هەرە بەرزەکانی فیردەوسی بالا، هەرگیز بەجێت نا هێڵێت . پیرۆزت بێت ئەو پرۆژەی، ئەگەر دەستی پێ بکەی، دەرگاکانی خێرو بەرەکەت و چاکەت لێ دەکرێنەوە و، هەر لە ئێستارا بەیەکجاریی خواحافیزیی لە خەم و خەفەت و دڵتەنگیی و ناڕەحەتیی و نیگەرانیی دەکەی... چاوت لە بەرەکەتی خوا بێت و دەست پێ بکە:بەناوی خوا.

## سوورەتی(فاتیحا) پرۆژەی ژیانە

لەدوای ئەم تەمەنە و، لەپاش وردبوونەوە لەسوورەتی (فاتیحا)، بۆم دەرکەوتوە ئەم سوورەتە کلیلی هەموو چاکەیەکە لە دنیا و دواڕۆژدا؛ چونکە ڕەحمەت و هیمەت و بەردەوامیی و، نێوەنجییەتیی و میانەڕەویی و، ئاشیی و ڕاستەڕێیی و، ئومێد و گەشبینیی تێدایە و، سوورەتی میهرەبانیی و سەرفرازیی و سەرکەوتنە و، نوشتوو و دوعا و زکر و زانستە و، ئەو نیشانانەی تێدان دەتگەیەننە سەرکەوتنی دنیا و قیامەت و، ڕێگای ڕزگاریی هەردووك دنیایە و، پوختەی سەرپاکی پەیامی پیغەمبەر(**صلى الله عليه وسلم**)و، هێڵە درشتەکانی شەریعەتی ئیسلامی تێدان و، سەرچاوەی کۆمەکی گیان و توێشووی ئیمان و سەرشاری هەرەگەرەی ژیانیکی پڕ لە هیواو گەشبینیی و سەرکەوتن و ڕەزامەندیی و ئاسوودەییە. ئەڵقەی ڕزگار بوونە لە تووڕەیی و سزای بەئێشی خوا، کەواتە لێی وردبەوە و دووبارەی کەوە، ئەمن لە نامیلکەیەکدا زیاتر لە دووسەت سوودم لێ دەرهێناوە و، هەندێك زانا زیاتر لە هەزار سوودیان لەم سوورە تە گەورە و شکۆدارە دەرهێناوە، خوای گەورە ڕاستی فەرمووە((**ولقد آتيْناك سبعًا من لمثاني والقرآن العظيم** – بەڕاستیی ئیمە حەوت ئایەت(لە سوورەتی فاتیحا)ی دووبارە بووە وە وقورئانی مەزنمان بۆ ناردووی)) **الحجر**( ٨٧ )...

## خۆت لەگەڵ خەڵکی بەراوردمەکە

نەکەی لە بەهرە و نیعمەتان خۆت دەگەڵ خەڵکی بەراورد بکەی؛ چونکە تووشی خەم و دڵتەنگیی دەبی و، ئیش بەم قسەی خوی گەورە بکە:((**فخُذْ ما آتيناك وكن من الشاكرين** – کەواتە: ئەوەی پێمان بەخشیوی، بیگرەو(بەبەکارهێنانی)لە سوپاسگوزاران بە)) **الأعراف**( ١٤٤ ). خەڵك لە تەبیعەت و بەهرە و ڕەوش و کات و

شوێنیاندا، جیاوازن، کەواتە: لە سنوور بەندیی و بەراورد دوورکەوە؛چونکە بە بەراوردکردن، زەبر لەخۆت دەدەی و، ڕووحی خۆت دەهاڕی و،ژیانت پڕدەکەی لە خەم و خەفەت؛ ئەو کابرایە شتێکی هەیە و ئەمن نیمە، ئەمن نەگەیشتوومە پایەی فلان کەس، دەمەوێ ئەمنیش وەك فلان زانا، بازرگان، نووسەر بم ! ئەوە شتێکی زۆر خراپە و، لە بەراورد دوورکەوە؛چونکە تۆ لەڕووی تایبەتمەندیی و خەسڵەتەکانتەوە، سەربەخۆ وجیاواز لە خەڵك لەم جیهانەدا دروستکراوی ، تەنها و سەربەخۆ لەم جیهانەدا دروستکراوی، ڕوخسارت بەتەواویی وەك کەس ناچێت و، ئەو تواناو بەهرانەی خوا بە تۆی داون، بە خەڵکی نەداون و، ئەو توانا و بەهرانەی بە خەڵکیشی داون، بە تۆی نەداون. جا ئەگەر خۆت لەگەڵ خەڵکی بەراوردکەی، لە کاتێکدا تۆ لە زات و خەسڵەکانتدا لەوان جیای، ئەوە ژیانت یەك پارچە دەبێتە داماویی و خەم و نیگەرانیی. کەواتە: نەکەی بەراورد بکەی؛ چونکە بەو بەراوردە دەزانی گەلێك کەس لە تۆ ساماندارتر و زاناتر و پایە بەرزتر و جوانتر و خانووگەورەترن؛ ئەو کاتە لە داخان لە ناخەوە دەهەژێی؛ بەگوێرەی زگماك و سروشتی خۆت بجووڵێ و، خەڵك لە کاروباری خۆیاندا بۆخۆیان بەجێ بێڵە ؛ چونکە ئەوان تواناو بەهرەی تایبەتیی خۆیان هەیە و، ئەوەی بەوانی بەخشیوە، هەر ئەویش بەتۆی بەخشیوە... کەواتە:بۆ خۆت بە خەسڵەت و تایبەت مەندییەکانی خۆتەوە بژی و، لەسەر ئەوشتانەی خوا پێی بەخشیوی، سوپاسی بکە.

## تۆ نە بابی مرۆڤایەتیی ، نە بەرپرسی خەڵکی

بە هەڵگرتنی بەرپرسیاریی خەڵك و چاودێریی و لێپرسینەوەیان، خۆت مەکوژە و، ئەوەندە بەداخی کێشە و کارە ساتەکانیان خۆت مەتوێنەوە، خۆت بهاڕی و ڕووحی خۆت بسووتێنی، خۆ تۆ نە بابی مرۆڤایەتی و، نە بەرپرسی هەموو خەڵکی؛خوا تۆی دروستکردوە و، تۆی تەنها کردوە بە بەرپرسی خۆت((**وَكُلَّ إِنسانٍ أَلزَمْناهُ طائِرَهُ في عُنُقِه ونخرج له يوم القيامةِ كتاباً يلقاه منشوراً** – ئەنجامی کاری هەموو کەسێکمان، وەك تۆق کردۆتە ملی و، ڕۆژیی دوایی بە نووسراوی سەرئاوەڵە نیشانی دەدەین)) **الإسراء** (١٣). تۆ لە چاکە و خراپەکانی خۆت بەر پرسی و، لە بەرانبەر خوا ڕادەوەستی تا دەربارەی خۆت و کردەوەکانی خۆت پرسیارت لێ بکرێت، بەڵام خەڵکی دیکە و هەڵسوکەوتەکانیان، ئەوە خوایەکیان هەیە، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات و، پاداشت و سزایان عایدی وی یە؛ ئەو دروستی کردوون و ڕۆزیی پێ داون، ئەتۆ نە کەست دروستکردوە، نەڕۆزیت بە کەس داوە و، لە بەرانبەریشدا، نە دەربارەی کەس لێپرسینەوەت دەگەڵ دەکرێت و، نە بە هۆی گوناحی کەس سزا دەدرێی.

کەواتە: لەو هاوبەشیی و هاوخەمییە ویژدانیی و لاشەیی و داراییانەی، وات لێ دەکەن پێت وابێ تۆ پارێزەر (محامی)ی هەموو کەسی و، سەرپەرشتی هەموو مرۆڤایەتیی و، پسپۆڕی چارەسەری کێشەکانی خەڵکی و، دۆسیەی هەموو تۆرەمەی ئادەم بە تۆ سپێرراوە، کەم کەوە ! بەزەییت بە ڕووحی خۆتدا بێتەوە و، باری سەرشانی سووك کە و، تواناکانی خۆت بزانە و، خەریکی خۆت بە و، ئەگەر ویستیشت بە بەشداریکردنێك یان دڵدانەوەیەك کە زیانت پێ ناگەیەنێت، دەست پێشخەریی بکەی، بیکە، چونکە ئیسلام فەرمانت پێ دەکات لەخۆترا دەست پێ بکەی.

تۆ خۆت لەسەرە و، لەپێشدا بایەخ بە خۆت بدە، خوایە گیان، سەڵات و سەلام بڕژێنە سەر موحەممەد و بنەماڵەی

موحەمەد، وەکو چۆن سەڵات و سەلامت ڕژاندە سەر ئیبڕاهیم و بنەماڵەی ئیبڕاهیم و، بەرەکەت بڕێژە سەر موحەمەد و بنەماڵەی موحەمەد ، هەر وەکو چۆن بەرەکەتت ڕژاندە سەر ئیبڕاهیم و بنەماڵەی ئیبڕاهیم، بەڕاستیی تۆ سوپاسکراو و سەرفرازی . خوایە گیان، پاك و بێگەردیی و سوپاس و ستایش بۆ تۆ، شاهیدیی دەدەم بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە. ((**سبحان ربك رب العزة عما يصفون. وسلام علي المرسلين. والحمد لله رب العالمين** – پاك و بێگەردیی بۆ پەروەردگاری تۆ، پەروەردگاری دەسەڵات و شکۆ لەوەی باسی دەکەن و سەلام لەپێغەمبەرانی خوا و، سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان)) **الصافات**:( ١٨٠- ١٨٢)،.

## ئەگەر دڵت تەنگ بوو، وەدەرکەوە و، لە دەستکردە شاکارەکانی بەدیهێنەر لە گەردووندا، ڕامێنە

دەگەڵ (تۆفیق جەمالەددینی سریلانکیی ) ی شوفێر و هاوڕێم ، چوومە سریلانکا، هەندێك خوێندکاریشمان دەگەڵ بوون ، تەماشامکرد ئەو وڵاتە لە وڵاتە هەرەجوانەکانی دنیایە؛ پڕە لە کێڵگە و باغی چا و مۆز و، تاڤگە و ڕووبار و، گوڵ و گوڵزار و بەروبووم و لێڕەوار، کە هەموویان هونەرمەندیی خوای تاکی باڵادەست دەنوێنن. بەیانیان دەچوومە دەرێ، سەیری شاخ و گرد و تەپۆلکە و قەدپاڵانم دەکرد، هەموویان باسی خوای گەورەیان بۆ دەکردم ، هەر دەتگوت دەرسی گەورەیی وەدیهێنەرم پێ دەڵێن؛ دەتگوت گوڵ قسەم دەگەڵ دەکات و، گوڵزار و باغی مۆز و نەعنا و مێخەك و ڕیحانە، بە زمانی حاڵ دەربارەی دەستکردە شاکارەکانی بەدیهێنەری بەرز و باڵا دەدوێن. کە بە نێو ئەو گردە سەوز و باغ و بێستانە جوان و ڕازاوانەدا دەڕۆیشتم ، دڵم دەکرایەوە و، تێدەگەیشتم کە خوا بۆیە ئەو شتانەی دروستکردوون تا مرۆڤ دڵ و دەروونی بکرێتەوە و، بەهۆی ئەوانەوە خوای بیسەری بینای شارەزای بەبەزەیی ببینێ ... ئەگەر دڵت تەنگ بوو، لە ئاوەدانیی وەدەرکەوە و بڕۆ بۆ دەرودەشت و شاخ و گرد و دۆڵ و باغ و بێستان؛ چونکە هەموویان باسی خوای گەورەت بۆ دەکەن ... جا لە ژووری مەمێنەوە، بیر لە ناخۆشییەکانی ڕابردوو و بیرەوەرییە خەماوییە کۆنەکانت بکەیەوە؛ (( **قُلِ ا نظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ** – بڵێ: تەماشاکەن چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە)) **يونس** ( ١٠١ ) .

# نێوەڕۆك